# دیاری
# بۆ شارەزابوون
# لە بیروباوەڕی ئیسلامی



هۆشیار نصرالدین کەلاری

# ناسنامەی کتێب


| | |
|---|---|
| ناوی پەرتوك: | " دیاری بۆ شارەزابوون لە بیروباوەڕی ئیسلامی " |
| نوسینی: | " فیصل بن مسفر الوادعي " |
| وەرگێڕانی: | " هۆشیار نصرالدین کەلاری " |
| نەخشەسازی بەرگ: | " کتێبخانەی گەشە" |
| نەخشەسازی ناوەوە: | " کتێبخانەی گەشە " |
| چاپکردن: | " کتێبخانەی گەشە " |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | " دووەم: ١٤٤٢ کۆچی – ٢٠٢١ میلادی " |

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «١٣٢٢»ی ساڵی «٢٠٢٠»ی پێ دراوە.**

# پێشەکی چاپی یەکەم

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان، سەڵات و سەلام وەك لێزمەی باران برژێ بەسەر پێغەمبەر و یاران، لەگەڵ شوێنکەوتوان بەچاکە و ئیحسان تا ڕۆژی پەسڵان.

دوای ئەوەی کتێبی (کورت و پوخت پێغەمبەرەکەت بناسە) کەوتە بەردیدی خوێنەران، هەندێ براو دڵسۆزی پەروەردەیی منداڵ و نەوەکانمان داوایان کرد کە بەردەوام بم لەنوسین و وەرگێڕانی هاوشێوەی ئەو کتێبە، بۆئەوەی ببێتە مەنهەج و پرۆگرامی خوێندن بۆ ڕێکخراو و ناوەندە ئیسلامیەکان .

یەکێك لەو بەڕێزانە بەتایبەتی پەیوەندی کرد و داوای کرد، بەڕێز مامۆستا سەردار نوری بوو لە دەڤەری ڕاپەڕین، هەر خۆیشی پێشنیاری ئەم کتێبەی بۆ کردم (الاستدلال على كنز الأطفال - بەڵگەباران لەسەر گەنجینەی منداڵان)، ئیتر منیش بینیم کتێبێکی بەسودە بەتایبەتی بۆ منداڵان و فێرخوازانی سەرەتایی زانستە شەرعیەکان ...

بۆیە پشتیوان بەخوای گەورە دەستم کرد بە وەرگێڕانی بەشی عەقیدەکەی کە خۆی دەبینیەوە لە ٣٩٠ پرسیار و وەڵام بەبەڵگەی قورئان و فەرموودەی سەحیح، منیش لەو ڕێژەیە بەپێی پێویست ١٥٠ پرسیار و وەڵامێکم لێ وەرگێڕا بۆئەوەی

قەبارەی کتێبەکە بچوك و زانیارییەکانی ناویشی کورت بێت و وابێ بۆ قۆناغێکی خوێندن و خولێکی هاوینەی ڕێکخراو و ناوەندە ئیسلامیەکان گونجاو بێت .

ئەوەی شایانی باسە لێرە ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە بۆ تەفسیری ئایەتەکان گەڕاوم بەدوای درووست ترین و کورت ترین تەفسیر لەبەر پارێزگاری لەبچوکی قەبارەی کتێبەکە بەدیاریکراوی سودم بینیوە لە هەریەکە لەتەفسیرەکانی (ئاسان و پوخت و ڕێبەر و ڕامان و پێشەنگ). هەروەها بۆ حوکمی فەرموودەکانیش نوسەر خۆی پشتی بەستوە بە ئەحکامەکانی شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێ کە زانایەکی فەرموودەناسی سەردەمە بۆیە بەندە بۆ حوکمی فەرموودەکان هیچ هەوڵێکم نەداوە !

نوسەر (د. فیصل الوادعي) خوای گەورە پاداشتی بداتەوە وەکو لە پێشەکی کتێبەکەدا باسی دەکات بۆیە بە شێوەی پرسیار و وەڵام نوسیویەتی لەبەر ئاسان تێگەیشتن و خێرا لەبەرکردن کە لەڕاستیدا ئەم شێوازەش کاریگەری خۆی هەیە بەتایبەتی بۆ منداڵان و فێرخوازانی سەرەتایی زانستە شەرعیەکان ..

لەکۆتاییدا سوپاس و دوعای خێرم هەیە بۆ هەریەکە لەبەڕێزان:
١- مامۆستا سەردار نوری کە پێشنیاری وەرگێڕانی ئەم کتێبەی بۆ کردم .
٢- ئەندازیار کارمەند عەزیز کە زەحمەتی کێشا نووسینەکەی لەنامەی مەسنجەرەوە گۆڕی بۆ ۆردی کۆمپیوتەری .

٣- كاك عبدالله مەسعود كە ئەركی كێشا لە هەندێ پێداچوونەوە و ڕێكخستنی نوسینەكە .

٤- هەموو ئەو خێرخوازانەی كە بەشدارن لە چاپ و لەدایكبوونی ئەم بەرهەمە ، داواكارم لەخوای گەورە كە ببێتە سەدەقە جاریە بۆیان .

٥- هاوسەر و هاوڕێی نزیكی ژیانم كە هەمیشە پاڵپشتم بوە بۆ ئەم جۆرە كارانە .

لەكۆتاییدا داواكارم لەخوای گەورە لێمانی وەرگرێ و بیخاتە سەر میزانی چاكەكانمان لەڕۆژی دوایی .

وصلى الله وسلم على محمد وعلى آل محمد

هوشیار نصرالدین كەلاری

١٤٤١/٤/١٥

٢٠١٩/١٢/١٢ كەلار

# پێشەکی چاپی دووەم

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمـدلله والصـلاة والسـلام على رسـول الله وعلى آله وصحبه ومن تـبعهم بإحسان إلى يوم الدين ، أما بعد:

سـوپاس و سـتایش بـۆ پەروەردگـاری جیهـان، سـەڵات و سـەلام وەك لێـزمەی بـاران لەسـەر پێغەمـبەری ئـاخر زەمـان و یـاران و شـوێنکەوتوانی تـا ڕۆژی پەسڵان.

پاشـان: پـاش ئەوەی چـاپی یەکەمـی ئەم کتێـبە بەفەزڵ و منەتـی خـوای پەروەردگـار لەلایەن فێرخـوازان و خـوێنەرانەوە جـێگەی ڕەزامەنـدی بـوو، هەروەهـا لە ناوەنـد و ڕێکخـراوە پەروەردەیـیە ئیسـلامیەکان کـرا بەمەنـهەج و ، تەنـانەت لەئاسـتی خێزانیشـدا سـودی خـۆی هەبـوو، هەمـوو ئەمـانە هۆکاربوون بۆئەوەی پێویست بکات جارێکی تر چاپی بکەینەوە .

سـوپاس بـۆ خـوای پەروەردگـار کتێبخـانەی گەشـە بڕیـاری دا چـاپی دووەمـی لەئەسـتۆ بگـرێ و بەنـدەش ڕەزامەنـدی دەربـڕی بەمەبەسـتی بەرژەوەنـدی گشتی.

داواکـارم لەخـوای پەروەردگـار لێمـانی قبـوڵ بفەرموێـت و بیکـاتە توێشـوویەك بۆ سەر میزانی چاکەکانمان .

وصلى الله على رسولنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

هوشيار نصرالدين کەلاری

٢١/ ٧/ ١٤٤٢

٦/ ٣/ ٢٠٢١ کەلار

پ ١/ پلەكانی دین كامانەن؟

وەڵام/ سێ پلەن:

١- ئیسلام.

٢- ئیمان.

٣- ئیحسان

بەڵگە: فەرموودەكەی عومەرە ڕەزای خوای لێبێ فەرمووی: (...وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِسْلَامِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ". قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ، يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ. قَالَ: " أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، خَيْرِهِ وَشَرِّهِ ". قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ : فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِحْسَانِ. قَالَ : " أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ "....) واتە: هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیسلام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیسلام بریتیە لەوەی شاهێدی بدەی كەهیچ پەرستراوێك نیە بەحەق و شایستەی پەرستن بێت تەنها الله نەبێ، هەروەها محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە و، نوێژ بەرپابكەیت و، زەكات بدەیت و، ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بگریت و، الحجی ماڵی خوا بكەی ئەگەر توانیت پێی بگەی....پاشان وتی: هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باوەڕ بهێنی بەخوا و، فریشتەكانی و، پەیام و كتێبەكانی و، پەیامبەرانی و، ڕۆژی دوایی و، هەروەها باوەڕیش بهێنی بە قەدەر خێر و شەڕی.... پاشان وتی: هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیحسان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

بەشێوەیەك بەندایەتی بۆخوا بکەی وەکو ئەوەی بیبینی، خۆئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ ئەبینێ.[1]

پ ٢/ ئەو چوار بابەتەی پێویستە لەسەرمان بیزانین کامانەن ؟

و/ یەکەم: زانست (العلم).

دووەم: ئیشکردن بەو زانستە (العمل به).

سێیەم: بانگەوازکردن بۆی (الدعوة إليه).

چوارەم: ئارامگرتن لەسەر ئەو ناڕەحەتییانەی بەهۆیەوە دێتە ڕێمان ( الصبر على الأذى فيه).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَٱلۡعَصۡرِ (١) إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ (٢) إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ (٣). واتە: سوێند بە زەمانە، سوێند بەکاتی عەسر (١) بەڕاستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایە (٢) بێجگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوەو ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە)، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگرو ئارامگریش بن (٣) [العصر: ١-٣]

پ ٣/ ئەو سێ بنچینەیە کامانەن کە پێویستە هەموو موسڵمانێك بیزانێت؟

---

[1] رواه مسلم (٨)

و/ ناسینی خوای پەروەردگار و، ناسینی پێغەمبەرەکەی و، ناسینی دینی پیرۆزی ئیسلام، ئەمانەش ئەو سێ پرسیارەن کەڕووبەڕوومان دەبێتەوە لەناوگۆڕدا

بەڵگە: فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازبە (ڕەزای خوای لێبێ) لەفەرموودەیەکی درێژدا هاتوە: (...فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولَانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ. فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا دِينُكَ ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الْإِسْلَامُ. فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ ؟ فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ...) واتە: دوو فریشتە دێن بۆلای مردووەکەو، دایدەنیشێنن و، پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێ یە؟...، دینت چی یە؟...، ئەو پیاوە کێبوو کەنێردرا بۆتان.[1]

پ ٤/ پەروەردگارت کێ یە ؟

و/ تاکە پەرستراوم الله یە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖ واتە: هەروەها بڵێ: ئایا ڕەوایە من جگە لە خوا بگەڕێم پەروەردگارێکی تر بکەمە پەروەردگاری خۆم لەکاتێکدا کە ئەو زاتە خاوەن و پەروەردگاری هەموو شتێکە؟ [الأنعام: ١٦٤]

پ ٥/ پێغەمبەر و پێشەوات کێ یە ؟

و/ پێغەمبەر و پێشەوام موحەممەدە ﷺ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيما واتە: محمد وەنەبی باوکی هیچ کەس

[1] رواه أحمد (١٨٥٣٤)، وصححه الألباني في المشكاة (١٣)

له پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێک زانایە [الأحزاب:٤٠]

پ ٦/ دین و بەرنامەی ژیانت چی یە؟

و/ دین و بەرنامەی ژیانم تەنها دینی پیرۆزی ئیسلامە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ واتە: بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە... [ال عمران: ١٩]

پ ٧/ کێ تۆی دروست کردوە؟

و/ خوای پەروەردگار من و هەموو دروستکراوەکانی تری دروست کردوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەر ئەویش سەرپەرشتیار و پارێزەری هەموو شتێکە [الزمر:٦٢]

پ ٨/ خوای پەروەردگار بۆچی دروستی کردوین؟

و/ بۆئەوەی بەندایەتی بۆ بکەین و بیپەرستین.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن [الذاريات: ٥٦]

پ ٩/ پێناسەی عیبادەت چی یە ؟

و/ ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوەی کەخوای پەروەردگار پێی خۆشە و پێی ڕازیە چ گوفتاربێ یا کردار دیاربێ یا نادیار.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: یَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێنەوە کڕنووش و سوژدە بەرن و (نوێژەکانتان بەجوانی بکەن) و پەروەردگارتان بپەرستن لە هەموو بارودۆخێکداو تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن [الحج: ٧٧].

هەروەها ئەفەرموێ: وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەڕێك و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی خوا. [البينة: ٥]

پ ١٠/ پێناسەی ئیسلام چی یە ؟

و/ بریتیە لە ملکەچبوون بۆ خوای پەروەردگار بەیەکتاپەرستی و گوێڕایەڵی کردنی و، هەروەها خۆ ڕزگارکردن و خۆبەریکردن لەهاوەڵدانان و ئەوانەشی کە هاوەڵدانەرن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَن يُسۡلِمۡ وَجۡهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ واتە: ئەو کەسەی ڕوو بکاتە پەروەردگاری و کارەکانی هەمووی بگێڕێتەوە بۆ لای ئەو، لە کاتێکدا ئادەمیزادێکی

چاکەخوازە، ئەوە بەڕاستی مانای وایە کە دەستی بە بە هێزترین کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە. [لقمان: ٢٢].

هەروەها ئەفەرموێ: قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ واتە: بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە .تاغوت (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نی یە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە. [البقرة: ٢٥٦].

پ ١١/ پایەکانی ئیسلام چەندن؟

و/ پێنجن، ئەوانیش: شەهادەتەین، نوێژبەرپاکردن، زەکات دان، ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان، الحج کردن.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئیبنو عومەرە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ). واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە بنیاتنراوە: شاهێدی دان کەوا هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق و شایستەی پەرستن بێت تەنها الله نەبێ، هەروەها محمد پێغەمبەری خوایەو، نوێژبەرپاکردن و، زەکات دان و، الحج کردن و، ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان.[1]

[1] رواه البخاري (٨)، ومسلم(١٦)

پ ١٢/ ئەو تەنها دینە چ دینێکە کەلای خوای پەروەردگار وەرگیراوە؟

و/ ئەو دینە تەنها دینی پیرۆزی ئیسلامە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

[ال عمران: ٨٥]

پ ١٣/ منداڵ لەسەر چ ڕێبازێك لەدایك دەبێ؟

و/ لەسەر ڕێبازی ئیسلام.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ ....) واتە: هەموو لەدایکبوویەك لەسەر فیترەت پاکی (ئیسلام - یەکخواپەرستی) لەدایك دەبێ.[1]

پ ١٤/ ناوی چوار دینی کوفر بژمێرە؟

و/ جولەکە( یەهودی)، گاور (نەسارا)، سابیئە، مەجوسی

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و ئەوانەش کە بوونەتە جوو، لەگەڵ صابئەکاندا کە فریشتە پەرست؛ یان ئەستێرە پەرستن و

[1] رواه البخاري (١٣٨٥)، و مسلم (٢٦٥٨)

گاورەکان و ئاگرپەرستەکان و ئەوانەی کە هەوەڵایان (بۆ خوا) بڕیارداوە، بێگومان خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا جیایان دەکاتەوە لەیەکترو بڕیاری خۆی دەدات لەسەریان، بەڕاستی خوا شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە. [الحج: ١٧]

پ ١٥/ ئایا گاور و جولەکە ڕازی ئەبن لەموسڵمانان؟

و/ نەخێر هەرگیز ڕازی نابن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ واتە: هەرگیز جولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئاین و بەرنامەیان نەکەویت، پێیان بڵێ: بەڕاستی هەر بەرنامەی خوا (ئاینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە هەموولایەکمان شوێنی بکەوین) هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە کە لە لایەن خواوە هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتییەکت دەست ناکەوێت. [البقرة: ١٢٠]

پ ١٦/ خراپترین و باشترین درووستکراوانی خوای پەروەردگار کێن؟

و/ خراپترین درووستکراوان بێباوەڕانن و، باشترین درووستکراوان باوەڕدارانن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ (٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ واتە: بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەن کتێبەکان و موشریك و هاوەڵگەران دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەو بە نەمری تیایدا بۆ

هەمیشە دەمێننەوە، هەر ئەوانەن تاوانبارترین و خراپترینی خەڵکانی سەرزەوی (٦) بێگومان ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، هەر ئەوانەن چاکترین و پاکترینی خەڵکانی سەر زەوی. [البينة: ٦، ٧]

پ ١٧/ ئایا بێباوەڕ لەژیانێکی خۆش دایە؟

و/ نەخێر.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ واتە: ئەوەیش ڕوو وەربگێرێت لە بەرنامە و یادی من پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین. [طه: ١٢٤]

پ ١٨/ ئەهلی کیتاب کێن؟

و/ گاور و جولەکەن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ واتە: جولەکە دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەك نین، گاورەکانیش دەڵێن جوولەکە لەسەر هیچ بنەماو ڕاستییەك نین، لە کاتێکدا ئەوانە کتێب (تەورات و ئینجیلی) دەخوێننەوە. [البقرة: ١١٣]

پ ١٩/ ئایا دینی ئیسلام کامڵ و تەواوە یا پێویستی بەتەواوکردنە؟

و/ دینی ئیسلام کامڵ و تەواوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ واتە ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان. [المائدة: ٣]

پ ٢٠/ کەسی موسڵمان لە کوێوە دینەکەی وەرگرێ؟

و/ لەقورئان و سوننەتەوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلا مَّا تَذَكَّرُونَ واتە: (خەڵكینە) شوێنی ئەو (بەرنامەیە) بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هێنراوەتە خوارەوە، جگە لەو زاتە شوێنی هیچ پشتیوان و خۆشەویستێکی تر مەکەون، کەم یاداوەری و پەند وەردەگرن و بیردەکەنەوە. [الأعراف: ٣]

هەروەها فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ رَسُولِهِ). واتە: من دوو شتم لەناوتاندا جێهێشتوە، دەستی پێوە بگرن گومڕا نابن: کتێبی خوا(قورئان) و، سوننەتی خۆم.[1]

پ ٢١/ نەفامی(جاهیلیەت) چی یە ؟

و/ هەرشتێك پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ.

[1] رواه الحاكم في المستدرك(٣١٩)، وصححه الألباني في المشكاة(١٨٦).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ واتە: ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە ؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە. [المائدة: ٥٠]

پ ٢٢/ یەکەم و کۆتا گرێی ئیسلام کامەیە کەهەڵدەوەشێتەوە؟
و/ یەکەم گرێی ئیسلام کە هەڵدەوەشێتەوە حوکمڕانی ئیسلامی یەو، کۆتا گرێی ئیسلام کە هەڵدەوەشێتەوە نوێژە.
بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو ئومامەی باهیلی یە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَتُنْقَضَنَّ عُرَى الْإِسْلَامِ عُرْوَةً عُرْوَةً، فَكُلَّمَا انْتَقَضَتْ عُرْوَةٌ تَشَبَّثَ النَّاسُ بِالَّتِي تَلِيهَا، وَأَوَّلُهُنَّ نَقْضًا الْحُكْمُ، وَآخِرُهُنَّ الصَّلَاةُ) واتە: سوێن بەخوا گرێ بەگرێی ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە، هەر گرێ یەك هەڵدەوەشێتەوە خەڵکی دەست دەگرن بەوەی دوای ئەوەوە، جا یەکەمین گرێ هەڵدەوەشێتەوە حوکمڕانی ئیسلامی یەو، کۆتا گرێیش نوێژە.[١]

پ ٢٣/ ئیحسان چی یە ؟
و/ بەشێوەیەك خوا پەرستی بکەی وەکو ئەوەی ببینی خۆئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ ئەبینێ.

---
[١] رواه أحمد (٢٢١٦٠ )، وصححه الألباني في صحيح الترغيب (٥٧٢)

بەڵگە: فەرموودەكەی عومەرە كەپێشتر لەوەڵامی پرسیاری یەكەمدا هێنامان، تیایدا هاتوە: ( ... أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ....) واتە: .... ئیحسان بریتیە لەوەی كە بەشێوەیەك خوا پەرستی بكەی وەكو ئەوەی ببینی خۆئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ دەبینێ.[1]

بەشی باوەڕبوون بەخوا

پ ٢٤/ پێناسەی ئیمان چی یە ؟

و/ گوفتاری زمانە و، باوەڕی دڵە و، كرداری جەستەیە، بەگوێڕایەڵی زیاد دەكات و، بەسەرپێچی و تاوان كەم دەكات.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ واتە: تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن [المائدة: ٢٣]

هەروەها فەرموودەكەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ - أَوْ: بِضْعٌ وَسِتُّونَ - شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ ) واتە: ئیمان حەفتاو ئەوەنە یان شەست و ئەوەنە بەشە، باشترینیان وتەی (لا إله إلا الله) یەو، نزمترینیان لادانی ئازارێكە لەسەر ڕێگا، شەرمكردنیش بەشێكە لەئیمان.[2]

پ ٢٥/ پایەكانی ئیمان چەندە؟

و/ شەشە:

---

[1] رواه مسلم (٨)

[2] رواه البخاري (٩)، ومسلم(٣٥)

١- ئیمان بەخوا.

٢- بەفریشتەکانی خوا.

٣- بەپەیامەکانی خوا.

٤- بەپەیامبەرانی خوا.

٥- بەڕۆژیی دوایی.

٦- بەقەدەر خێر و شەڕی.

بەڵگە: فەرموودەکەی عومەرە (ڕەزای خوای لێبێ) تیایدا هاتوە: ( ... أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، خَيْرِهِ وَشَرِّهِ ....). واتە: ئیمان بێنی بەخوا و، فریشتەکانی و، پەیامەکانی و، پەیامبەرانی و، ڕۆژی دوایی و، هەروەها باوەڕیش بێنی بەقەدەر خێر و شەڕی.[1]

پ ٢٦/ ئایا ئیمان زیاد و کەم دەکات؟

و/ بەڵێ: بەگوێڕایەڵی و چاکەکاری زیاد دەکات و، بەسەرپێچی و خراپەکاری کەم دەکات

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَانا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێک ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێهەم) (لە هەموو کارو بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن [الأنفال: ٢]

---

[1] رواه مسلم (٨)

هەروەها فەرموودەکەی حەنزەڵەیە (ڕەزای خوای لێبێ) کەتیایدا هاتوە پێغەمبەر ﷺ پێی ئەفەرموێ: ( ولكن ساعة وساعة ) واتە: ...بەڵام ساتێك ئێمانتان بەرزدەبێتەوە و ساتێك دادەبەزێ.[1]

پ ٢٧/ ئیمان چەند بەشی هەیە؟

و/ شەست و ئەوەنە یان حەفتاو ئەوەنە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە کەپێشتر هێنامان ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ - أَوْ: بِضْعٌ وَسِتُّونَ - شُعْبَةً، ...). واتە: ئیمان حەفتاو ئەوەنە بەشە یان شەست و ئەوەنە بەشە.[2]

پ ٢٨/ باڵاترین بەشی ئیمان کامەیە؟

و/ وتەی (لا إله إلا الله ) یە.

پ ٢٩/ نزمترین بەشی ئیمان کامەیە ؟

و/ لادانی ناڕەحەتیەکە لەسەر ڕێگا.

پ ٣٠/ بەهێزترین گرێی ئیمان کامەیە ؟

و/ خۆشەویستی لەبەرخوا و، ڕق لێبونەوە لەبەرخوا، هەروەها دۆستایەتی لەبەرخوا و، دوژمنایەتی لەبەرخوا.

---

[1] رواه مسلم (٢٧٥٠)

[2] رواه البخاري (٩)، ومسلم(٣٥)

بەڵگە: فەرموودەکەی ئیبنو عەباسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی بەئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێ): (أوثق عري الإيمان الموالاة في الله والمعاداة في الله والحب في الله والبغض في الله). واتە: بەهێزترین گرێی ئیمان دۆستایەتی لەبەرخوا و دوژمنایەتی لەبەرخوایە، هەروەها خۆشەویستی لەبەرخوا و ڕق لێبونەوە لەبەرخوایە.[1]

پ ٣١/ کامیان لای خوای پەروەردگار خۆشەویست ترن ئیمانداری بەهێز یا لاواز؟

و/ ئیمانداری بەهێز

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ...). واتە: ئیمانداری بەهێز باشتر و خۆشەویست ترە لای خوای پەروەردگار لەئیمانداری لاواز، بەڵام هەردووکیشیان هەر باشن...[2]

پ ٣٢/ یەکەمین واجب لەسەر بەندەکان چی یە؟

و/ یەکتاپەرستی (تەوحید) ە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئیبنو عەباسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ کاتێ پێغەمبەر ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن (ڕەزای خوای لێبێ) پێی فەرموو: ( ادْعُهُمْ

---

[1] صححه الألباني في الصحيحة(٩٨٨)

[2] رواه مسلم (٢٦٦٤).

إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، ...). واته:...بايەكەمین شتێك بانگیان دەكەی بۆی یەكتاپەرستی (تەوحید) ی خوای پەروەردگار بێت.[1]

پ ٣٣/ ئەو شتە چیە كەهەموو پێغەمبەران بانگەوازیان بۆ كردوە؟

و/ بەندایەتی خوای پەروەردگار بەتەنها و، دووركەوتنەوە لەتاغوت

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرمویٚ: وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ واته: بەدڵنیایی ئێمە بۆ هەموو كۆمەڵە خەڵك و نەتەوەیەك لە شوێنێك ژیابێتن پێغەمبەرێكمان بۆ ناردوون ئیشی هەموو پێغەمبەران ئەوە بووە بە خەڵكەكەیان وتووە: ئەی خەڵكینە بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و شەریك بۆ خوا دامەنێن و خۆتان دووربخەنەوە لە تاغوتەكان (وەكو شەیتان و فاڵچیەكان و ساحیرەكان و بت و هەموو كەسێك كە بپەرسترێت و ڕازی بێت بەو پەرستنە، یان بانگەوازی خەڵكی بكات بۆ پەرستنی خۆی، یان باوەڕی بە حوكمی خوای گەورە نەبێت و بە كۆنەپەرستی بزانێت، یان حوكمێكی تر بەباشتر بزانێت لە حوكمی خوا، یان یەكسانی بكات بە حوكمی خوا) [النحل: ٣٦]

پ ٣٤/ دۆستانی خوای پەروەردگار كێن؟

و/ ئەوانەن كەئیمان هێناوە و پارێزكارن (تەقوادارن)

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرمویٚ: أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (٦٢) ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ واته: ئاگادار بن كە بەڕاستی چاكان و خۆشەویستانی خوای میهرەبان نەترس و بیم ڕوویان تێدەكات (لە سەرە مەرگ و لە

---

[1] رواه البخاري (٧٣٧٢)، و مسلم (١٩).

ڕۆژی لێ پرسینەوەدا)، نەغەم و پەژارە و دڵتەنگی دایان دەگرێت (بەڵکو فریشتەکان بەڕوو خۆشیەوە مژدەی سەرفرازی و خۆشنوودیان دەدەنێ) (٦٢) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و هەمیشە خۆیان دەپارێزن و لەخوا دەترسن. [یونس: ٦٢-٦٣]

پ ٣٥ / مافی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەکانی چی یە؟

و/ بیپەرستن و هیچ شەریکی بۆ دانەنێن.

پ ٣٦/ مافی بەندەکان بەسەر خوای پەروەردگارەوە چی یە؟

و/ سزای ئەوانە نەدات کەشەریکی بۆ دانانێن.

بەڵگە: فەرموودەکەی موعازی کوڕی جەبەلە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ( يَا مُعَاذُ، أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ ؟ ". قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: " أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ ؟ ". قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: " أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ ). واتە: ئەی موعاز، ئەزانی مافی خوای پەروەردگار بەسەر بەندەکانیەوە چی یە؟ هەروەها مافی بەندەکان بەسەر خوای پەروەردگارەوە چی یە؟ وتم: خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: بزانە کە مافی خوای پەروەردگار بەسەر بەندەکانیەوە ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شەریکی بۆ دانەنێن، هەروەها مافی بەندەکان بەسەر خوای پەروەردگارەوە ئەوەیە کە سزای ئەوانە نەدات کەشەریکی بۆ دانانێن.[1]

---

[1] رواه البخاري (٦٢٦٧)، و مسلم (٣٠)

پ ٣٧/ تەوحید چەند بەشە؟

و/ سێ بەشە: تەوحیدی ڕوبیەت و، تەوحیدی ئولوهیەت و، تەوحیدی ئەسماء و سیفات

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَاتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا واتە: ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، کەواتە، هەر ئەو بپەرستە و زۆر بەردەوام و خۆگربە لە پەرستنیدا، ئایا کەس شک دەبەیت هاوناوی ئەو و هاوتای ئەو بێت؟ (خاوەنی سیفەتی بەرزو بڵندو پیرۆز بێت وەک ئەو؟!) [مریم: ٦٥]

پ ٣٨/ پێناسەی تەوحیدی ڕوبیەت بکە؟

و/ بریتیە لە: خوا بەتەنها دانان لەکردارەکانی وەکو درووستکردن و ڕۆزیدان و بەڕێوەبردن

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ واتە: خوا ئەو زاتەیە کە دروستی کردوون و پاشان ڕزق و ڕۆزی پێبەخشیون (ئاوو هەواو خۆرو خاك و هۆکارەکانی بەدەست هێنانی سامان بەشێکن لە بەخششەکانی) لەدوایدا دەتانمرێنێت، پاشان زیندووتان دەکاتەوە، ئایا هیچ کام لەوانەی کە کردوتانن بە هاوبەشی خوا، شتی وایان لە دەست دێت؟! پاکی و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە لەوەی ئەوانە دەیکەن بە هاوبەشی. [الروم: ٤٠]

پ ٣٩/ پێناسەی تەوحیدی ئولوهیەت بکە؟

و/ بریتیە لە تەنها عیبادەت کردن بۆ خوای پەروەردگار؟

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا. [الإسراء: ٢٣]

پ ٤٠/ پێناسەی تەوحیدی ئەسماء و سیفات بکە؟

و/ بریتیە لە سەلماندنی ئەوەی خوای پەروەردگار بۆخۆی سەلماندویەتی، یان پێغەمبەرەکەی ﷺ سەلماندویەتی لەناو و سیفاتەکانی بەبێ چواندن و، هاوشێوە دانان و، لەکارخستن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی خوا بەکاردەهێنن بۆ غەیری خوا)، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا. [الأعراف: ١٨٠]

پ ٤١/ وشەی تەوحید کامەیە؟

و/ ( لا إله إلا الله ) یە

بەڵگە: فەرموودەکەی ئیبنو عەباسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ کاتێ موعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: (ادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ...). واتە: بایەکەمین شتێك بانگیان دەکەی بۆی تەوحیدی خوای پەروەردگار بێت ...

لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە: بۆ ئەوەی شاهێدی بدەن بە أشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله.[1]

پ ٤٢/ مانای لا إله إلا الله چی یە؟

و/ هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق شایستەی پەرستن بێت تەنها الله نەبێ

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ واتە: ئەمە لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەر خوا هەق و ڕاستە و بێگومان ئەوەی جگە لە خوا هاواری لێ دەکەن (دەیپەرستن) هەر ئەوە بەتاڵ و ناڕاست و بەڕاستی خوا هەر خۆی بەرزو بڵندو گەورەیە. [الحج: ٦٢]

پ ٤٣/ مەرجەکانی شایەتومان ( أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله ) چی یە ؟

و/ ١- زانست (العلم).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلَا يَمۡلِكُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ واتە: ئەوانەی جگە لە خوای گەورە کە ئێوە کردووتانن بە خوا ئەوانە توانای ئەوەیان نیە لای خوای گەورە شەفاعەتتان بۆ بکەن تەنها کەسانێك نەبێت شایەتیان بە حەق دابێ واتە: بە یەکخواپەرستی و زانیاریان هەبووبێ لەسەر زانیاری و چاوڕۆشنی ئەو شایەتیەیان دابێ ئەوە شەفەعەتیان بە ئیزن و ڕەزامەندی خوا سودی دەبێت. [الزخرف: ٨٦]

---

[1] رواه البخاري (٧٣٧٢)، و مسلم (١٩)

٢ - یەقین.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کەباوەڕیان بەخواو پێغەمبەری خوا هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە... [الحجرات: ١٥]

٣ - ملکەچبوون.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَن يُسۡلِمۡ وَجۡهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ واتە: هەر کەسێك خۆی تەسلیمی خوای گەورە بکات و کارەکانی بە خوای گەورە بسپێرێ و ئیخلاص و دڵسۆزی و نیەتی بۆ خوا بێت و چاکەکاریش بێت، واتە: کردەوەکانی لەسەر سوننەت بێت و ملکەچی شەریعەت بێت ئەوە بە دڵنیایی دەستی گرتووە بە پەتی هەرە بەهێزەوە کە دینەکەی خوای گەورەیە کە پچڕانی بۆ نیە و سەرەنجامی هەموو کارەکانیش تەنها بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێتەوە. [لقمان: ٢٢]

٤ - وەرگرتن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّهُمۡ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسۡتَكۡبِرُونَ واتە: ئەوان لە دونیادا کاتێك کە پێیان بووترایە بڵێن: (لا إله إلا الله) خۆیان بە گەورە ئەزانی لە وەرگرتنی حەق و (لا إله إلا الله) داو نەیاندەوت و شوێنی نەدەکەوتن. [الصافات: ٣٥]

٥ - ئیخڵاس و نیازپاکی.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ واتە: ئایا پەرستنی پاك و بێگەرد لە شیرك و ڕیا تەنها بۆ خوای گەورە نیە، (واتە: خوای گەورە، پەرستن و

کردەوەیەك قبوڵ دەكات و وەردەگرێت کە تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەو ئەنجام درابێت)... [الزمر: ٣]

٦ - ڕاستگۆیی.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون. [العنكبوت: ٣]

٧ - خۆشەویستی.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کەس لە ئێوە لە ئاین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەکات) ئەوە لە ئایندەدا خوا کەسانێک دەهێنێتە کایەوە (ئەوەندە ڕێک و پێک و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت... [المائدة: ٥٤]

٨ - کوفرکردن بەتاغوت.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ واتە: ...جا هەر کەسێ کوفر بە تاغوتەکان بکات و ئیمان بەخوای گەورە بێنێ ئەوە دەستی گرتووە بە حەبل و پەتی هەرە بەهێزەوە کە ئیسلام و قورئان و لا إله إلا الله یە کە بەهیچ شێوازێك ئەو حەبل و پەتە پچڕانی بۆ نیە تا ئەتگەیەنێ بە بەهەشت و خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە. [البقرة: ٢٥٦]

هەندێ لەزانایانیش کۆیان کردۆتەوە لەدوو بەیت دا: زانست ویەقین و ئیخلاس و ڕاستگۆییت لەگەڵ خۆشویستن و ملکەچبوون و، وەرگرتنت بۆی هەشتەمیش زیادبکە کوفرکردنت بە هەموو ئەوانەی جگە لەخوا کراونەتە خوا.

پ ٤٤/ پایەکانی ( لا إله إلا الله ) چی یە ؟

و/ دوو پایەی هەیە، ئەوانیش:

١- نەفی کردن ( لا إله - هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق).

٢ -سەلماندن ( إلا الله - تەنها الله نەبێت).

پ ٤٥/ خوای پەروەردگار لەکوێ یە؟

و/ لەئاسمانە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ واتە: ئایا ئێوە ئەمینن لەو خوایەی کە لە ئاسمانە بە ناخی زەویدا ناتانبات و ڕۆتان ناچێنێ هەروەکو چۆن (قارون)ی بە ناخی زەویدا بردە خوارەوە کە زەویەکە بهەژێت و بجوولێت و ئەو هێمنی و ئارامییەی کە هەیەتی نەیمێنێت. [الملك: ١٦].

هەروەها فەرموودەکەی موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: (... وَكَانَتْ لِي جَارِيَةٌ تَرْعَى غَنَمًا لِي قِبَلَ أُحُدٍ وَالْجَوَّانِيَّةِ، فَاطَّلَعْتُ ذَاتَ يَوْمٍ، فَإِذَا الذِّيبُ قَدْ ذَهَبَ بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِهَا، وَأَنَا رَجُلٌ مِنْ بَنِي آدَمَ آسَفُ كَمَا يَأْسَفُونَ، لَكِنِّي صَكَكْتُهَا صَكَّةً، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَيَّ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أُعْتِقُهَا ؟ قَالَ: " ائْتِنِي بِهَا "، فَأَتَيْتُهُ بِهَا. فَقَالَ لَهَا: " أَيْنَ اللَّهُ ؟ " قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ. قَالَ: " مَنْ أَنَا ؟ " قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ: " أَعْتِقْهَا،

فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ). واتە: کەنیزەکێکم هەبوو شوانی هەندێ مەالروماڵاتی بۆ ئەکردم لەقەدپاڵی کێوی ئوحود و جەوانیە، ڕۆژێکیان بینیم گورگێك مەڕێکی بردوە، منیش پیاوێکم لەنەوەی ئادەم، توڕەئەبم وەکو چۆن خەڵکی توڕەئەبێ، بەڵام من زللەیەکم لێدا، دواتر ڕۆشتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ زۆر بەگەورەی زانی لەسەرم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: بیهێنە بۆم ، منیش هێنام بۆی، پێی فەرموو: خوا لەکوێ یە؟ کەنیزەکەکە وتی: لەئاسمانە، فەرمووی: من کێم؟ وتی: تۆ پێغەمبەری خوای، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئازادی بکە، چونکە ئیمانداره.[١]

پ ٤٦/ ئایا خوای پەروەردگار لەگەڵماندایە؟

و/ بەڵێ بەزانستی و، ئاگاداریی و، بیستنی و، بینینی لەگەڵماندایە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ واتە: ... و ئێوە لە هەر شوێنێك بن خوای گەورە لە گەڵتاندایە (بە زانست و زانیاری و بیستن و بینین و تواناو دەسەڵاتی) و هەرچی کردەوەیەك کە ئێوە ئەیکەن خوای گەورە زۆر بینایەو هەمووی ئەبینێ و هیچی لێناشاردرێتەوە. [الحديد: ٤]

پ ٤٧/ ئایا جگە لەخوا کەسی تر غەیب دەزانێت؟

و/ نەخێر جگە لەخوا کەسی تر غەیب نازانێ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ واتە: ئەی پێغەمبەری ﷺ پێیان بڵێ: جگە لە خوا

---

[١] رواه مسلم (٥٣٧)

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هیچیان ئاگادارینین لە پەنهان و شاراوەکان، هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە. [النمل: ٦٥].

پ ٤٨/ ڕاست ترین وتەیەك شاعر وتبێتی کامەیە؟

و/ وتەکەی لەبیدە: ألا كل شيء ما خلا الله باطل.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ ؛ أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ...). ڕاست ترین وتەیەك شاعر وتبێتی وتەکەی لەبیدە: بزانن کەوا هەموو شتێك جگە لەخوا پوچە.[1]

پ ٤٩/ گەورەترین چاکە کامەیە؟

و/ تەوحیدی خوای پەروەردگارە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم (هاوەڵ دانان) نە کردووە هێمنی و ئاسایش تەنها بۆ ئەوانەیە هەر ئەوانەش ڕێنمایی کراوون. [الانعام: ٨٢].

هەروەها فەرموودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵایە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَقِيَهُ يُشْرِكُ بِهِ دَخَلَ النَّارَ). واتە: هەرکەسێ بگا بەخوا و هیچ شەریکی بۆ

[1] رواه البخاري (٣٨٤١)، و مسلم (٢٢٥٦).

دانەنابێ ئەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسێ بگا بەخوا و شەریکی بۆ دانابێ ئەڕواتە دۆزەخەوە.[1]

پ ٥٠/ گەورەترین تاوان کامەیە؟

و/ هاوەڵ ( شەریك ) دانان بۆ خوای پەروەردگار.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت و (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریک و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومرا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور. [النساء: ١١٦].

پ ٥١/ شيرك ( هاوەڵدانان ) چی یە؟

و/ بريتيە لە پەرستنی غەيرە خوای گەورە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا واتە: (ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن...[النساء: ٣٦].

هەروەها فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ) واتە: خوای پەروەردگار فەرموويەتی: من

[1] رواه مسلم (٩٣).

دەوڵەمەندترینی شەریکەکانم لەشەریك بڕیاردان، هەرکەسێ کردەوەیەك ئەنجامبدات و تیایدا شەریکم بۆ بڕیار بدات، خۆی و شیرکەکەی وازلێدێنم.[1]

پ ٥٢/ گەورەترین تاوانە گەورەکان کامانەن؟

و/ شەریك بڕیاردان و، ئازاردانی دایك و باوك و، شاهێدی درۆ.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو بەکرە نوفەیعی کوڕی حارسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ". ثَلَاثًا، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: " الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ ". وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فَقَالَ: " أَلَا وَقَوْلُ الزُّورِ ". قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ) واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ سەبارەت بە گەورەترینی تاوانە گەورەکان ؟ ئایا هەواڵتان بدەمێ سەبارەت بە گەورەترینی تاوانە گەورەکان ؟ ئایا هەواڵتان بدەمێ سەبارەت بە گەورەترینی تاوانە گەورەکان ؟ شەریك بڕیاردان و، ئازاردانی دایك و باوك و، شاهێدی درۆ یان وتەی درۆ.[2]

پ ٥٣/ حەوت لەناوبەرەکە کامانەن ؟

و/ ( ... الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ). واتە: ... شەریك بڕیاردان و، سیحر و، کوشتنی بەناحەق و، خواردنی ماڵی یەتیم و،

---

[1] رواه مسلم (٢٩٨٥).

[2] رواه البخاري (٢٦٥٤)، و مسلم (٨٧).

خواردنی ڕیبا(سو)، ڕاکردن و پشتهەڵکردن لە ڕۆژی جیهاد ولەمەیدانی جەنگ و، هەروەها بوختان کردن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای ئیماندار.[1]

پ ٥٤/ ئایا کردەوەی چاك لەگەڵ ئەنجامدانی شیرکدا سودی بۆ خاوەنەکەی هەیە؟

و/ نەخێر، لەبەرئەوەی شیرك بڕیاردان کردار پوچ دەکاتەوە

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ واتە: ...ئەگەر شەریک و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کارو کردەوەیەکی (چاکیشیان) هەیە هەمووی پووچ و بێ نرخ دەبێت. [الانعام: ٨٨].

پ ٥٥/ ئایا قوربانی کردن بۆ جگە لەخوا درووستە؟

و/ نەخێر درووست نیە.

بەڵگە: فەرموودەکەی عەلی یە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (... لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ،...). واتە: خوا نەفرەتی کردوە لەوکەسەی قوربانی بۆ جگە لەخوا دەکات.[2]

پ ٥٦/ گرنگی پاڕانەوە چی یە ؟

و/ پاڕانەوە عیبادەتە

بەڵگە: فەرموودەکەی نوعمانی کوڕی بەشیرە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ ...). واتە: پاڕانەوە خۆی عیبادەتە.[1]

---

[1] بوخاری (٢٧٦٦)، و موسلم(٨٩) لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە (ڕەزای خوای لێبێ)

[2] رواه مسلم (١٩٧٨).

پ ٥٧/ حوكمی هاواركردنە مردوان و ئامادەنەبوو (غائب) چی یە؟

و/ شیركی گەورەیە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَـٰفِلُونَ (٥) وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَـٰفِرِينَ (٦) واتە: گومڕاترین كەس ئەوانەن كە جگە لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە هەروەكو دەفەرموێت: هیچ كەسێك لەو كەسە گومڕاتر نیە كە جگە لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە لە كەسانێك كە تا ڕۆژی قیامەت لێیان بپاڕێیتەوە وەڵامت نادەنەوەو توانای وەڵام دانەوەیان نیە، نەك هەر توانای وەڵامدانەوەیان نیە بەڵكو بێئاگان لە دوعاو پاڕانەوەی ئێوەو هەر نایشی بیستن، و كاتێك لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵكی حەشر ئەكرێ، پیاوچاكان و پێغەمبەران و مەلائیكەتەكان ئەبن بە دوژمنی ئەو كەسانەی كە لێیان پاڕاونەتەوەو پەرستوویانن و ئەوان بەم پەرستنەی ئەمان بێ باوەڕن و نكوڵی لێ ئەكەن و ئەڵێن بۆ ئێمەتان كردە شەریك بۆ خوای گەورە. [الأحقاف (٥،٦)].

پ ٥٨/ ئایا درووستە لەپاڕانەوەكانماندا هاوار بكەینە پێغەمبەر ﷺ ؟

و/ نەخێر درووست نیە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَأَنَّ ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا واتە: بێگومان مزگەوتان تایبەتی خوان كەواتە لەگەڵ خوادا هاوار لە كەسی تر مەكەن. [الجن: ١٨].

---

[١] صححه الألباني في صحيح أبي داود (١٣١٢).

پ ٥٩/ ئایا درووستە ناوی منداڵەکانمان بنێن بە ( عبدالکعبة، عبدالمحمد، عبدالحسین )؟

و/ نەخێر درووست نیە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا واتە: هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان بە بەندەیی دێنە لای خوای میهرەبان هیچ کەسێ لەوانە نیە بەندەی خوای میهرەبان نەبێ. [مریم: ٩٣].

پ ٦٠/ سزای کەسێك چی یە کەدەچێتە لای فاڵچی و جادوباز؟

و/ ئەگەر تەنها بچێتە لای و باوەڕی پێ نەهێنێ ئەوا چل شەو نوێژی لێ وەرناگیرێ، خۆئەگەر باوەڕی پێبکات ئەوا کافر دەبێتەوە و لەدین دەرەچێ.

بەڵگە: فەرموودەکەی یەکێك لەدایکانی ئیماندارانە (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرموێ: (مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ ؛ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً). واتە: هەرکەسێ بچێتە لای فاڵچیەك و پرسیاری لێبکا سەبارەت بەهەرشتێك، ئەوا چل شەو نوێژی لێ وەرناگیرێ.[1]

هەروەها فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەفەرموێ: (مَنْ أَتَى كَاهِنًا، أَوْ عَرَّافًا، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ). واتە: هەرکەسێ بچێتە لای فاڵچیەك یان جادوبازێك و قسەکانی بەڕاست بزانێ، ئەوا کافر بووە بەوەی دابەزیوە بۆ سەر محمد ﷺ.[2]

[1] رواه مسلم (٢٢٣٠).

[2] رواه الترمذي (١٣٥)، وصححه الألباني في الصحيحة (٣٣٨٧).

پ ٦١/ حوکمی سیحر کردن چی یه ؟

و/ سیحر کردن کوفره

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْۖ واتە: ... و سولەیمان کافر نەبوە و فێری سحریش نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان بێباوەڕبوون کاتێك خەڵکیان فێری سیحر کرد بۆ تێکدانی دینەکەیان، بەو شێوەیە جولەکە شوێن ئەو سیحرە کەوتن. کەدابەزیوەتە سەر ئەو دوو فریشتەیە ( هاڕوت و ماڕوت) لەزەوی بابل لەعێڕاق وەك تاقیکردنەوەیەك بۆ بەندەکانی خوای گەورە، جا ئەو دوو فریشتەیە کەسیان فێری سیحر نەدەکرد بەڵکو ئاگاداریان دەکردن لەئاشوب و خراپەی سیحر فێربوون و، پێیان دەوتن: کافرمەبنەوە بەفێربوونی سیحر و گوێڕایەڵی شەیتانەکان... [البقرة: ١٠٢]

پ ٦٢/ نوشرە چی یە و حوکمی چی یە ؟

و/ نوشرە، پوچەڵکردنەوەی سیحرە لەکەسی سیحر لێکراو.

حوکمیشی ئەگەر بە سیحر بێت درووست نیە.

بەڵگە: فەرموودەکەی جابری کوڕی عەبدوڵایە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: (سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ النُّشْرَةِ ، فَقَالَ: " هُوَ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ). واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە نوشرە، ئەویش فەرمووی: لەکردەوەی شەیتانە.[١] بەڵام ئەگەر بە ڕوقیەی شەرعی بێت درووستە.

[١] رواه أبوداود (٣٨٦٨)، وصححه الألباني في المشكاة (٤٥٥٣).

بەڵگە: فەرموودەکەی عەوفی کوڕی مالکی ئەشجەعیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (....، اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ، لَا بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ). واتە: ڕوقیەکانتان بخەنە ڕوو بۆم، ڕوقیە ئەگەر شیرکی تێدا نەبێت درووستە و هیچی تێدانیە.[1]

پ ٦٣/ تەمیمە چی یە؟

و/ بریتیە لە هەڵواسینی مورو یاهەرشتێکی لەوبابەتە و، کەسەکە باوەڕی وایە دەیپارێزی لەچاوی پیس یاخود لە جنۆکە.

پ ٦٤/ حوکمی تەمیمە چی یە ؟

و/ درووست نیە، چونکە بەشێکە لەشیرك.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئیبنو مەسعودە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ( ... إِنَّ الرُّقَى، وَالتَّمَائِمَ، وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ، ...). واتە: ڕوقیە (ئەوەی کەبەشتی ناشەرعی دەکرێ) و، تەمائیم و، سیحر بریتین لەشەریك بڕیاردان.[2]

پ ٦٥/ حوکمی سەربڕاوی دەستی بێباوەڕی جگە لە جولەکە و گاور چی یە ؟

و/ درووست نیە خواردنی.

---

[1] رواه مسلم (٢٢٠٠).

[2] رواه أحمد( ٣٦١٥)، وصححه الألباني في الصحيحة (٣٣١).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلَا تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنرایەوە (کاتی سەربڕین) بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە... [الانعام: ١٢١].

پ ٦٦/ بەچی سوێن بخۆین؟

و/ بەناوێك لەناوەکانی خوای پەروەردگار، یان سیفەتێك لەسیفەتەکانی.

بەڵگە: فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی عومەرە (ڕەزای خوای لێبێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ) واتە: هەرکەسێ سوێن ئەخوات، ئەوا با تەنها سوێن بەخوا بخوات یان بێدەنگ بێت و سوێن نەخوات.[1]

پ ٦٧/ حوکمی جنێودان بە خوای پەروەردگار، یان پێغەمبەرەکەی ﷺ، یان دینەکەی چی یە ؟

و/ کوفری گەورەیە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ واتە: ...بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟! (٦٥) (ئیتر بێ سوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو...[التوبة (٦٥، ٦٦)].

پ ٦٨/ موسڵمانان بەچی حوکمڕانی دەکەن؟

---

[1] رواه البخاري (٢٦٧٩)، و مسلم (١٦٤٦).

و/ بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ واتە: ... تۆ لە نێوان ئەوانیشدا حوکم بەو قورئانە بکە کە خوای گەورە دایبەزاندووە (لە نێوان عەرەب و عەجەم و ئەهلی کتاب)، و شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان مەکەوە لەو حەقەی کە خوای گەورە بۆتی دابەزاندووە... [المائدة: ٤٩].

هەروەها خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ واتە: ... لە هەموو شتێکدا حوکم و بڕیار هەر بۆ خوای گەورەیە.... [الانعام: ٥٧]

پ ٦٩/ پێناسەی تاغوت چی یە؟

و/ بریتیە لە هەر شتێ کە بەندە لەسنوری خۆی دەریکا، چ پەرستراو بێ یا شوێنکەوتە یا فەرمانبەردار.

پ ٧٠/ سەرانی تاغوتەکان چەندن؟

و/ پێنالجن:

١ - شەیتانی نەفرەت لێکراو.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا واتە: ئەوانەی ئیماندارن (تەنها) لە پێناوی خوادا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و (تاغوت)دا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە. [النساء: ٧٦].

٢ - هەرکەسێ بیپەرستن و پێی ڕازی بێ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَارِدُونَ واتە: بێگومان ئێوە و ئەو شتانەی لە جیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمەنی دۆزەخن و سەلکە بزوتی ئاگرن، دەبێت هەر بچنە ناوی و هەمیشە تێیدان. [الأنبياء: ٩٨].

٣ - هەرکەسێ خەڵکی بانگ بکات بۆئەوەی بیپەرستن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ واتە: بچۆ بۆ لای فیرعەون (چونکە) بەڕاستی لە سنوور دەرچووە و ستەمی بێ ئەندازەیە. [النازعات: ١٧].

٤ - هەرکەسێ بانگەشەی زانینی غەیب بکات.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: هیچ کەسێك نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا غەیب و نهێنی بزانێ جگە لە زاتی پیرۆزی الله...[النمل: ٦٥].

٥ - هەرکەسێ حوکمڕانی بە قورئان نەکات.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدا واتە: ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت)

نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێ سنوور. [النساء: ٦٠].

پ ٧١/ حوکمی نکوڵی کردنی بوونی (جن) چی یە؟

و/ نکوڵی کردنی بوونی (جن) کوفری گەورەیە لەبەرئەوەی نکوڵی کردنی قورئانە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا واتە: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بەڕاستی دەستەیەك لە (جنەکان) گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جا کە تەواو بووە وتویانە: بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست. [الجن: ١].

پ ٧٢/ حوکمی جنێودان بە هاوەڵان (ڕەزای خوای لێبێ) چی یە ؟

و/ کوفری گەورەیە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من سب أصحابي، فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين ). واتە: هەرکەسێ جنێو ئەداتە هاوەڵانم ئەوا نەفرەتی خوا و، فریشتەکان و، هەموو خەڵکی لەسەربێ.[1]

پ ٧٣/ بەچی تکا لەخوای گەورە بکەین؟

و/ ١- بەناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی.

---

[1] رواه أحمد في فضائل الصحابة(٨)، وهو في الصحيحة (٢٣٤٠).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا. [الأعراف: ١٨٠].

٢ - بەکردەوەی چاکە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ واتە: پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانەت کردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دە تۆیش لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە. [ال عمران: ٥٣].

هەروەها فەرموودەکەی ئیبنو عومەرە (ڕەزای خوای لێبێ) لەو فەرموودە درێژەی کەچیرۆکی سێ پیاوی بەنی ئیسرائیل ئەگێڕێتەوە کەچونەتە ئەشکەوتێکەوە و بەردێك بەردەمی ئەشکەوتەکەیان لێدەگرێ: ....جا وتیان: بەڕاستی لەم بەردە ڕزگارتان نابێ تاکو بەکردەوە چاکەکانتان نەپاڕێنەوە لەخوای گەورە...[١]

٣ -بەپاڕانەوەی پیاو چاکان.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی جومعەدا وتاری ئەدا، لەناکاو پیاوێك هات بۆلای و وتی: (يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ الْمَالُ وَجَاعَ الْعِيَالُ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا، فَرَفَعَ يَدَيْهِ...). واتە: ئەی

---

[١] رواه البخاري (٢٢٧٢)، و مسلم (٢٧٤٣).

پێغەمبەری خوا باران نەماوە، داوا لەخوا بکە بارانمان بۆ ببارێنێ، ئەویش دوعای کرد و بارانمان بۆ باری.[1]

پ ٧٤/ مانای محمد رسول الله (محمد پێغەمبەری خوایە) چی یە ؟

و/ مانای ئەوەیە کەپێغەمبەری خوایە بۆهەموو خەڵکی بە(جن) و مرۆڤەوە، هەروەها پێویستە لەسەرمان گوێڕایەڵی بین و بەڕاستی بخەینەوە و، دووربکەوینەوە لەوەی کەنەهی لێکردوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ واتە: ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد ئەی موحەممەد (ﷺ) کە بۆ تەواوی خەڵکانی جیهان، ببیتە موژدەدەرو ترسێنە بەڵام زۆربەی مەردم نازانن. [السبأ: ٢٨].

هەروەها خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ واتە: پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر بن...[النور: ٥٤].

پ ٧٥/ ئەو کەسە کێ یە کەدەبێ لەهەموو کەسێ زیاتر خۆشمان بوێ؟

و/ ئەوکەسە موحەممەدە پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ). واتە: هەریەك لەئێوە ئیمانی نیە تاوەکو منی لاخۆشەویست تر نەبێ لەمنداڵەکەی و باوکی و هەموو خەڵکی.[2]

---

[1] رواه البخاري (٩٣٣)، و مسلم (٨٩٧).

[2] رواه البخاري (١٥)، و مسلم (٤٤).

پ ٧٦/ مەرجەکانی وەرگرتنی کردەوە چی یە؟

و/ ١- ئیخلاس و بۆخوابوون

٢ -شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەرێك و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە ڕاست و بەنرخەکانی خوا. [البينة: ٥].

هەروەها فەرموودەکەی عائیشە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ). واتە: هەرکەسێ هەرشتێك داهێنێ لەم دینەمان و لەخۆی نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەتەوە و وەرنەگیراوە.[١]

پ ٧٧/ چ ناوێ لەو کردەوەیە بنێین کەلەسەر سوننەتی پێغەمبەر خوا ﷺ نیە؟

و/ بیدعە.

بەڵگە: فەرموودەکەی عیربازی کوڕی ساریەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری ئەکردین....فەرمووی: ( .... وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ ؛ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ ) واتە: ...ئامان وریای داهێنراوە تازەکان بن، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیە و، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە).[٢]

---

[١] رواه البخاري (٢٦٩٧)، و مسلم (١٧١٨).

[٢] رواه أحمد (١٧١٤٥)، و أبوداود (٤٦٠٧)، وصححه الألباني في الإرواء (١٦٥).

پ ٧٨/ ئایا بیدعە خراپ و گومڕاییە؟

و/ بەڵێ.

پ ٧٩/ ئایا بیدعەی حەسەنە هەیە؟

و/ نەخێر، هەرچی بیدعە هەیە گومڕاییە.

بەڵگە: فەرموودەکەی عیربازی کوڕی ساریەیە (ڕەزای خوای لێبێ).

پ ٨٠/ ئیمان هێنان بە فریشتە و بەهەشت و دۆزەخ و حەوزی کەوسەر و سیڕات و، هەموو ئەو شتانەی تر کەبەچاوەکانمان نایبینین پێی ئەڵێن چی؟

و/ ئیمان بەغەیب.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ واتە: ئەوانەی باوەڕ بە نەبینراوەکان دەهێنن (وەك خوا و فریشتە و ئەوانەی خوا باسی کردوون و ئێمە نایانبینین)، هەروەها نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزییە (حەڵاڵەی) پێمان بەخشیوون، دەبەخشن. [البقرة : ٣].

پ ٨١/ فریشتە لەچی درووست کراوە؟

و/ لە نور (ڕووناکی).

بەڵگە: فەرموودەکەی عائیشەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ). واتە: فریشتە لە نور ( ڕووناکی ) درووست کراون[١]

پ ٨٢/ باشترینی فریشتەکان کێ یە ؟

و/ جبريله (عليه السلام).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ (١٩) ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ(٢٠) مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ واتە: (سوێند بەوانە هەمووی) بەڕاستی، بێ دوودڵی ئەم قورئانە لەزاری نێردراوێکی بەڕێزەوەیە (کە جوبرەئیلە)(١٩) خاوەنی

---

[١] رواه مسلم (٢٩٩٦).

هێزو دەسەڵاتە و لای خاوەنی عەرش، فریشتەیەکی پایەدارە(٢٠) و جبریل لەناو فریشتەکانی تردا گوێڕایەڵی ئەکرێ، و لەوێ ئەمینیشە لەسەر ئەو وەحییەی خوای گەورە کە پیایدا ناردوویەتی بە ئەمانەتەوە گەیاندوویەتی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم [التکویر(١٩ - ٢١)].

پ ٨٣/ ڕوحو لقودس کێ یە ؟

و/ جبریلە (علیه السلام).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ واتە: ئەی محمد صلی الله علیه وسلم پێیان بڵێ: ڕوح القدس، (جوبرەئیل، ئەم قورئانەی) لە لایەن پەروەردگارتەوە بە حەق و ڕاستی دابەزاندووە، بۆ ئەوەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دامەزراو پایەدار بکات و ڕێنموویی و مژدەشە بۆ موسوڵمانان. [النحل (١٠٢)].

پ ٨٤/ ڕوحو لئەمین کێ یە ؟

و/ جبریلە (علیه السلام).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ (١٩٣) عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ واتە: جوبرەئیلی ئەمین (فریشتەی وەحی) دایبەزاندووە (١٩٣) بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد صلی الله علیه وسلم تا بچیتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە خەڵکی بێداردەکەنەوە و لە خەوی غەفڵەت دایاندەچڵەکێنن. [الشعراء (١٩٣-١٩٤)].

پ ٨٥/ ژمارەی فریشتەکان زانراوە؟

و/ نەخێر ژمارەیان زۆر زۆرە و جگە لەخوای پەروەردگار کەس نایزانێ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ واتە: ...كەس ژمارەی سەربازانی پەروەردگارت نازانێ جگە لەخۆی...[المدثر: ٣١].
هەروەها فەرموودەكەی ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (...أَطَّتِ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلَّا وَمَلَكٌ وَاضِعٌ جَبْهَتَهُ سَاجِدًا لِلَّهِ...). واتە: ئاسمان ئەنكێنێ و مافی خۆیەتی بنكێنێ، شوێنی چوار پەنجەی لێ نیە مەگەر فریشتەیەك نێوچاوانی داناوە لەسوژدەدا بۆ خوا.[1]

پ ٨٦/ هەندێ لە وەزیفەی فریشتەكان بژمێرە ؟
و/ ١- فریشتەی گەڕۆك بەدوای ئەڵقەی زیكرەوەن.
بەڵگە: فەرموودەكەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ، يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ...). واتە: خوای پەروەردگار كۆمەڵێ فریشتەی گەڕۆكی هەن كەبەدوای ئەڵقەی زیكرەوەن...[2]
٢ -فریشتەی پاراستنی كردەوەكان.بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ (١٠) كِرَامٗا كَٰتِبِينَ واتە: بە دڵنیایی كەسانێك لەسەر ئێوەیە كە فریشتە بەڕێزەكانن كردەوەكانی ئێوە دەنوسن و دەپارێزن (١٠) كە ئەو فریشتانە زۆر بەڕێزن و هەموو شتێك كە ئێوە ئەیكەن هەر هەمووی ئەنووسن و ئەپارێزن و هەمووی هەڵئەگرن. [الانفطار (١٠- ١١)].
٣ -فریشتەی پاراستنی جەستە.
بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: لَهُۥ مُعَقِّبَاتٞ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ واتە: خوای گەورە فریشتە پارێزەرەكانی هەیە كە لە پێش و

---
[1] رواه الترمذی (٢٣١٢)، وهو في الصحيحة (١٧٢٢).
[2] رواه مسلم (٢٦٨٩).

دواوەی مرۆڤەوە بە فەرمانی خوای گەورە مرۆڤەکان ئەپارێزن لە ڕووداوەکان...[ڕەعد: ١١].

٤- فریشتەی هەڵگری عەرش.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ واتە: ...لەسەرووی ئەمانیشەوە لەسەرووی ئاسمانیشەوە هەشت مەلائیکەت، یان هەشت پۆل و کۆمەڵ مەلائیکەت عەرشی خوای گەورەیان هەڵگرتووە کە لەوپەڕی گەورەییدان و خوای گەورە خۆی نەبێ کەس نازانێ ژمارەیان چەندە. [الحاقة: ١٧].

٥ -فریشتەی گەنجینەی بەهەشت.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ واتە: لەولاشەوە ئەوانەی کە پارێزکار و بەندەی ملکەچی پەروەردگاریان بوون، ئەوانەی حسابیان بۆ ئەو ڕۆژە دەکرد دەستە دەستە و پۆل پۆل بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێ دەکرێن بەرەو بەهەشت، هەتا کاتێ کە دەگەنە ئەوێ دەروازەکانی لە ڕوویاندا کراوەیە و لە سەر پشتە، فریشتەکانی بەرپرس و سەرپەرشتیارانی بەهەشت زۆر بەگەرمی و ڕووخۆشیەوە پێشوازییان لێ دەکەن و دەڵێن: درود و سڵاوتان لێبێت، ئێوە پاک و خاوێنن، کەواتە فەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا. [الزمر: ٧٣].

٦ - فریشتەی گەنجینەی دۆزەخ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ واتە: ...هەر کاتێك کە کۆمەڵێك لە کافران فڕێ ئەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە دەرگاوانانی دۆزەخ لە فریشتەکان وەکو سەرزەنشت کردن پرسیاریان لێ ئەکەن ئایا

ئێوە لە دونیادا هیچ ترسێنەرو پێغەمبەرێك نەهات کە ئاگادارتان بکاتەوە لە ترسناکی و مەترسی ئەم ڕۆژە؟ [الملك: ٨].

٧ -فریشتەی لێپرسینەوەی ناوگۆڕ.

بەڵگە: فەرموودەکەی بەرائی کوڕی عازبە (ڕەزای خوای لێبێ) لەفەرموودەیەکی درێژدا هاتوە: ( ...فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولَانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ ؟...).... واتە: دوو فریشتە دێن بۆلای مردووەکەو دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێ یە ؟...[1]

٨ -فریشتەی گیان کێشان.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ واتە: جا پێیان بڵێ: فریشتەی گیان کێشان کە کاری گیان کێشانتانی پێ سپێردراوە دەتانمرێنێت، لەوەودوا بۆلای پەروەردگارتان دەبرێنەوە. [السجدة: ١١].

پ ٨٧/ ئایا فریشتە باڵی هەیە؟

و/ بەڵێ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ واتە: سوپاس وستایش بۆ خوایە، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە، فریشتەکانی کردووە بە فرستادەی خۆی کە خاوەنی چەندەها باڵن، هەیانە دوو، یان سێ، یان چوار باڵە، لە دروستکردندا هەرچی بوێت زیادی دەکات...[فاطر: ١].

[1] رواه أحمد (١٣٤٤٦)، وصححه الألباني في المشكاة (١٣١).

پ ٨٨/ جبريل (عليه السلام) چەن باڵی هەیە؟

و/ ٦٠٠ باڵی هەیە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئیبنو مەسعودە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: ( ... أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ ). واتە: محمد ﷺ جبریلی بینیوە علیه السلام ٦٠٠ باڵی هەبووە.[١]

پ ٨٩/ فریشتە باڵەکانی بۆ کێ ڕادەخات؟

و/ بۆ فێرخوازی زانستی شەرعی.

بەڵگە: فەرموودەکەی سەفوانی کوڕی عەساله (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ... وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ ...).

واتە: بەدڵنیاییەوە فریشتە باڵەکانی ڕادەخات بۆ فێرخوازی زانستی شەرعی وەکو ڕەزامەندییەك لەبەرئەو زانستەی بەدوایا دەگەڕێ...[٢]

---

[١] رواه البخاري (٣٢٣٢)، و مسلم (١٧٤).

[٢] رواه الترمذي (٢٦٨٢)، وحسنه الألباني كما في صحيح الترمذي (٢٨٠١).

پ ٩٠/ ئایا (جن) و شەیتانەکان لەسەر شێوەی خۆیان ئەبینین؟

و/ نەخێر.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ واتە: ...بێگومان شەیتان و دارو دەستەی ئێوە دەبینن، لە شوێنێکدا کە (دنیایە) ئێوە ئەوان نابینن... [الأعراف: ٢٧].

پ ٩١/ ئایا لە (جن) و شەیتانەکان بترسین؟

و/ نەخێر، بەڵکو تەنها لەخوای پەروەردگار بترسین.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخۡشَوۡنَهُۥ وَلَا يَخۡشَوۡنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَۗ واتە: ئەوانەی کە پەیامەکانی خوا دەگەیەنن، و لەو دەترسن و جگە لەو لە هیچ کەسی تر ناترسن...[الأحزاب: ٣٩].

پ ٩٢/ ئایا (جن) هەموویان بێباوەڕ و کافرن؟

و/ نەخێر، بەڵکو هەیانە نوسڵمانە و، هەیانە کافرە

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَأَنَّا مِنَّا ٱلۡمُسۡلِمُونَ وَمِنَّا ٱلۡقَٰسِطُونَۖ فَمَنۡ أَسۡلَمَ فَأُوْلَٰٓئِكَ تَحَرَّوۡاْ رَشَدٗا (١٤) وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبٗاواتە: بەڕاستی لەناو ئێمەدا کەسانی موسوڵمان و خواناس هەیە، کەسانی بێ دین و خوانەناس و سەر کەشیش، جا ئەوەی موسوڵمان دەبێت دیارە کە ڕێبازی سەر فرازی دۆزیوەتەوە (١٤) بەڵام خوانەناس و سەر کەشەکان بەسەریانەوە ناچێت بەڵکو دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ. [الجن (١٤- ١٥)].

پ ٩٣/ ئایا شەیتانەکان نیشتەجێی ماڵی مرۆڤەکان دەبن؟

و/ بەڵێ.

پ ٩٤/ چۆن دەربکرێن لەماڵەکاندا؟

و/ بە (بسم الله) کردن و، زیکری خوا و،خوێندنی قورئان بەتایبەتی سورەتی البقرة.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ ؛ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ).واتە: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان، چونکە شەیتان لەماڵێك هەڵدێ کەسورەتی البقرەی تێدا دەخوێنرێ.[1]

پ ٩٥/ ئایا (جن) غەیب دەزانێ؟

و/ نەخێر.

بەڵگە: خوای پەروەردگار سەبارەت بە پێغەمبەر سولەیمان (علیه السلام) ئەفەرموێ: فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُواْ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ واتە: کاتێك کە بڕیاری مردنمان بەسەر سولەیمان پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) کە خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا جنیەکان هەموویان ئیشیان ئەکرد کەسیان نەیانزانی کە سولەیمان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مردووە تەنها (مۆرانە) نەبێ کاتێك کە گۆچانەکەی خوارد ئەو کاتە سولەیمان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەوتە سەرزەوی [فَلَمَّا خَرَّ] کاتێك کە گۆچانەکەی نەما سولەیمان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەوتە سەر زەوی ئەو کاتە جن بۆیان

[1] رواه مسلم (٧٨٠).

دەرکەوت کە ئەگەر ئێمە غەیبمان بزانیایە ئەمانزانی چەندێکە مردووەو لەو ئیشە قورسانەدا نەئەماینەوە کە سولەیمان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی دەکردین، دوای ئەوەی کە مرد ئیتر ڕۆیشتن وازیان لە ئیش کردن هێنا (ابن عباس و مجاهدو قتادەو حسن ئەڵێن: نزیکەی ساڵێك بووە مردووە ئینجا جنییەکان زانیویانە). [السبأ: ١٤].

پ ٩٦/ ئیمان هێنان بەکتێبە ئاسمانیەکان تاچەند گرنگە؟

و/ یەکێکە لەپایەکانی ئیمان و بەبێ ئەوە ئیمان دامەزراو نابێت.

بەڵگە: فەرموودەکەی عومەرە کەپێشتر لەوەڵامی پرسیاری یەکەمدا هێنامان تیایدا هاتوە: (... قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، خَيْرِهِ وَشَرِّهِ...). واتە: ئیمان بریتیە لە باوەڕهێنان بەخوا و، فریشتەکانی و پەیامەکانی و پەیامبەرانی و ڕۆژی دوایی و هەروەها باوەڕیش بێنی بەقەدەر خێر و شەڕی.[1]

پ ٩٧/ ناوی هەندێ لەکتێبە ئاسمانیەکان بنوسە ؟

و/ ١- قورئان کەبۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزیوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ واتە: ...من ئەم قورئانەشم بەوەحی و نیگا بۆ هاتووە تا ئێوەو هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە ئاگادارو بێدار بکەم... [الانعام: ١٩].

٢ - تەوڕات کەبۆ موسا (علیه السلام) دابەزیوە.

بەڵگە: فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازبە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ بە یەکێك لەزانایانی جولەکەی وت: ( .... أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ ؟ ....). واتە: سوێنت ئەدەم بەو خوایەی کەتەوڕاتی دابەزاندوە بۆسەر موسا، ئاوا حەد(سزا)ی زیناکار لەکتێبەکەتاندا هەیە.[2]

٣ - ئنجیل کەبۆ عیسا (علیه السلام) دابەزیوە.

---

[1] رواه مسلم (٨).

[2] رواه مسلم (١٧٠٠).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَقَفَّيۡنَا بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَۖ واتە: ...و بە دوای ئەواندا عیسای کوڕی مەریەممان (صلى الله عليه وسلم) ناردووە، وەئینجیلیشمان پێ بەخشیوە...[الحديد: ٢٧].

٤ - زەبورِ کەبۆ داود (عليه السلام) دابەزیوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا واتە: ....وە زەبوریشمان بە داود پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەخشیووە. [الإسراء: ٥٥].

پ ٩٨/ ئایا درووستە ئێستا تەوڕات و ئنجیل بخوێنینەوە؟

و/ نەخێر درووست نیە، چونکە دەستکاری کراوە و، هەروەها بەهاتنی قورئان هەڵوەشێنراونەتەوە (نەسخ) کراونەتەوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡۗ واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم)بە ئەهلی کتاب بە جوولەکەو گاورەکان بفەرمە: ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین ئەو دینەی کە ئێستا ئێوەی لەسەرن پووچەڵ و بەتاڵە، تا تەورات و ئینجیل جێبەجێ نەکەن لەبەر ئەوەی لە تەورات و ئینجیلدا مژدەی هاتنی محمد (صلى الله عليه وسلم) هەیە و فەرمانیشتان پێکراوە کە شوێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەون، و تا شوێن ئەوەیش نەکەون کە لە پەروەردگارەوە بۆتان دابەزیوە کە قورئانی پیرۆزەو بۆ تێکڕای خەڵکی دابەزیوە...[المائدة: ٦٨].

پ ٩٩ /ئیمان هێنان بە پێغەمبەران تاچەند گرنگە؟

و/ یەکێکە لەپایەکانی ئیمان و بەبێ ئەوە ئیمان دامەزراو نابێت.

بەڵگە: فەرموودەکەی عومەرە کەپێشتر لەوەڵامی پرسیاری یەکەمدا هێنامان تیایدا هاتوە: ئیمان بریتیە لە باوەڕهێنان بەخوا و، فریشتەکانی و پەیامەکانی و پەیامبەرانی و ڕۆژی دوایی و هەروەها باوەڕیش بێنی بەقەدەر خێر و شەڕی.[١]

پ ١٠٠/ باوکی مرۆڤایەتی کێ یە؟

و/ ئادەم (علیه السلام).

بەڵگە: فەرموودە درێژەکەی شەفاعەیە کەئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەیگێڕێتەوە، تیایدا هاتوە: ( ... فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ أَبُو النَّاسِ، ...)، واتە: ...جا تێن بۆلای ئادەم علیه السلام و، پێی دەڵێن: تۆ باوکی مرۆڤایەتیت...[٢]

پ ١٠١/ کێ یەکەمینی پێغەمبەران بوو؟

و/ ئادەم علیه السلام.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو ئومامەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: ( أَنَّ رَجُلًا، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَبِيٌّ كَانَ آدَمُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، ...)، واتە: کەسێك پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئادەم پێغەمبەر بوو؟ فەرمووی: بەڵێ...[٣]

پ ١٠٢/ کێ کۆتا پێغەمبەرە؟

---

[١] رواه مسلم (٨).

[٢] رواه البخاري (٣٣٤٠)، ومسلم(١٩٤).

[٣] رواه ابن حبان (٦١٩٠)، وصححه الألبانی في الصحيحة (٣٢٨٩).

و/ محمد پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ واتە: محمد وەنەبی باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە...[الأحزاب: ٤٠]

پ ١٠٣/ کێن ئولولعەزم (خاوەن عەزم) لەپێغەمبەران ؟

و/ هەموو پێغەمبەران خاوەن عەزمن، بەڵام ئەوانەیان کەزیاتر عەزمیان هەیە: نوح و إبراهیم وموسا و عیسا و محدە (سەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێت).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئارام بگرە هەروەکو چۆن پێغەمبەرانی (ئولول عەزم) کە خاوەنی عەزیمەت و دامەزراوی بوونە ئارامیان گرتووە لەبەرامبەر ئازاری قەومەکانیان کە (نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمد) بوونە (سەڵات و سەلامی خوایان لێ بێت)، و پەلەی سزا مەکە سزایان بۆ داببەزێ... [الأحقاف: ٣٥].

ئەوانەشی کە عەزمیان زیاترە بەتایبەت باسی کردوون، وەکو دەفەرموێت: شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ واتە: خوای گەورە تەشریع و یاسای بۆ ئێوە داناوە لەم دینەدا، و وەسیەت و ئامۆژگاری بۆ نوح پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردووە بە یەکخواپەرستی و ئەوەی کە بەوەحی بۆ تۆمان ناردووە، و ئەوەی کە ئامۆژگاری ئیبراهیم و موسى و عیسامان پێکردووە کە لە تەوحیددا هەموویان یەك بوونە (جێگیر کردنی دین و پەرتەوازە نەبوون)... [الشورى: ١٣].

پ ١٠٤/ باشترینی پێغەمبەران کێ یە؟

و/ محمد پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، ...). واتە: من گەورەی نەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا...[1]

پ ١٠٥/ ئایا پێغەمبەران کاری شوانیان کردووە؟

و/ بەڵێ.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلَّا رَعَى الْغَنَمَ،...). واتە: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردوە ئیلا شوانکارەی کردوە...[2]

پ ١٠٦/ ئایا پێغەمبەران ماڵیان بەمیرات جێهێشتووە؟

و/ نەخێر، ئەوەی لەماڵی دونیا لەدوایان بەجێمابێ ئەوە سەدەقەیە بۆ ئوممەتەکەیان.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو بەکرە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَا نُورَثُ مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَة ...). واتە: ئێمەی پێغەمبەران میراتیمان نیە، ئەوەی دوای خۆمان بەجێی دێڵین سەدەقەیە.[3]

---

[1] رواه مسلم (٢٢٧٨).

[2] رواه البخاري (٢٢٦٢).

[3] رواه البخاري (٣٠٩٤)، و مسلم (١٧٥٧).

پ ١٠٧/ ئایا زەوی جەستەی پێغەمبەران ئەڕزێنی (دەخوات)؟

و/ نەخێر.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەوسی کوڕی ئەوسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ... إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ ).

واتە: خوای پەروەردگار خواردنی جەستەی پێغەمبەرانی لەسەر زەوی حەرام کردوە.[١]

پ ١٠٨/ ئایا لەناو پێغەمبەران دا ئافرەت هەیە؟

و/ نەخێر پێغەمبەرێتی تایبەتە بەپیاوان.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) لە پێش تۆشدا بۆ ئوممەتانی تر هیچ کەسێکمان نەناردووە ئیلا پیاوانێك نەبێ کە وەحیمان بۆ ناردوون و مرۆڤ بوونەو جن و فریشتە نەبوونە، و پیاو بوونەو ئافرەت نەبوونە، ئێوەش پرسیار لە زانایانی یەهودو نەصارا بکەن ئەوان ئەو شتەیان ئەزانی کە پێغەمبەران مرۆڤ بوونەو پیاو بوونەو لەلایەن خوای گەورەوە هاتوونە، و لە هەموو کاروبارێکی دیندا پرسیار لە زانایان بکەن ئەگەر ئێوە نەتانزانی. [الأنبياء: ٧].

پ ١٠٩/ ئایا خوای پەروەردگار باسی هەموو پێغەمبەرانی بۆ کردوین؟

و/ نەخێر.

---

[١] رواه أبوداود (١٠٤٧)، وهو في الصحيحة (١٥٢٧).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلا مِّن قَبۡلِكَ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَۗ واتە: بەڕاستی ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی تریشمان ڕەوانە کردووە، هەیانە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیانمان بۆ گێڕاویتەوە، هەشیانە کە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیمان بۆ نەگێڕاویتەوە... [غافر: ٧٨].

پ ١١٠/ کام پێغەمبەرەیە خوای گەورە بەرزی کردۆتەوە بۆلای خۆی و، تا ئێستاش زیندووە؟

و/ عیسا (علیه السلام).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا (١٥٧) بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيما واتە: و درۆیشیان کردو شانازیان ئەکرد بە کوشتنی عیساوە (صلى الله عليه وسلم) ئەیانووت: ئێمە (عیسای کوڕی مەریەم)مان (صلى الله عليه وسلم) کوشتووە خوای گەورە بەدرۆیان ئەخاتەوە ئەوان نە عیسایان (صلى الله عليه وسلم) کوشت و نە لە خاچیشیاندا بەڵکو لێیان تێکچوو شێوەی عیسا (صلى الله عليه وسلم) خرایە سەر یەکێك لە حەواریەکانی و ئەویان کوشت و خۆشیان هەر گومانیان هەبوو ئایا ئەمە عیسایە (صلى الله عليه وسلم) یان حەوارییەکەیە و ئەو کەسانەی کە ئیختیلاف و جیاوازیان هەبوو لە عیساد (علیه السلام) کە هەندێکیان وتیان: کوشتمان و هەندێکیان بینیان کە خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان وتیان: نەمان کوشتووەو جیاوازی کەوتە نێوانیان ئا ئەمانە خۆیان گومانیان هەیە سەبارەت بە عیسی (صلى الله عليه وسلم) و هیچ زانیارییەکیان نیە لەو بارەیەوە تەنها شوێنی گومان کەوتوونەو دوو دڵن و بە یەقینی

ئەوان عیسایان (صلى الله عليه وسلم) نەکوشت (١٥٧) بەڵکو خوای گەورە عیسای (صلى الله عليه وسلم) بەرز کردەوە بۆ لای خۆی و ئەمەش بۆ خوای گەورە ئاسانە خوای گەورە زۆر بە عیززەت و باڵادەستە و زۆر کاربەجێیە ئیشەکانی خوای گەورە پڕە لە حیکمەت. [النساء: (١٥٧-١٥٨].

پ ١١١/ بیروباوەڕی گاورەکان چۆنە سەبارەت بە عیسای کوڕی مریم؟
و/ هەندێکیان دەڵێن: خوایە، هەندێکیان دەڵێن: کوڕی خوایە، هەندێکیان دەڵێن: سێیەمینی سێ خواکە (نعوذ بالله).
بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ واتە: سوێند بێت بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون کە وتیان: بەڕاستی خوا، هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە... [المائدة: ١٧].
هەروەها ئەفەرموێ: وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ واتە: ... و گاورەکان وتیان: عیسا کوڕی خوای گەورەیە ئەمە قسەی ئەوان بوو کە بەدەم ئەیانکرد بەبێ ئەوەی کە بیری لێ بکەنەوە کە ئەم قسانەیان هاوشێوەی قسەی بت پەرستان و کافرانی پێشتر بوو کە بە لات و عوززاو مەناتیان ئەوت: ئەمانە کچی خوای گەورەن، یان ئەیانوت: مەلائیکەت کچی خوای گەورەیە خوا بیانکوژێ و لەناویان بدات، یان نەفرەتی خوای گەورەیان لێ بێت چۆن لەم حەقە لائەدەن و ئەچنە سەر باتڵ. [التوبة: ٣٠].
هەروەها ئەفەرموێ: : لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ واتە: بەدڵنیایی ئەو کەسانە کافربوون کە ئەیانووت: سێ خوا هەیەو خوای گەورە یەکێکە لە سێ

خوایەکە کە مەبەستیان زاتی پیرۆزی الله و عیسا و مەریەم بوو، ئەم ئایەتە لەسەر گاورەکان دابەزی ئەوان وادەڵێن... [المائدة: ٧٣].

پ ١١٢/ بیروباوەڕی درووست و تەواو سەبارەت بە عیسای کوڕی مریم چی یە؟

و/ بەندەی خوایە و، کوڕی بەندەی خوایە و، پێغەمبەری خوایەو، وشەی خوایە ناردوویەتی بۆ مریم و، گیانێکە لەو هەموو گیانەی خوا درووستی کردوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُ واتە: ئەی ئەهلی کتاب ئەی جولەکەو گاورەکان زیادڕەوی مەکەن و سنوور مەبەزێنن لە دینەکەتاندا کە جوولەکە زیادڕەویان ئەکرد تا وتیان: عوزێر کوڕی خوایە، و گاورەکانیش زیادڕەویان کرد لە عیسادا تا وتیان: کوڕی خوایە، دواتر وتیان: خوایە، ئەوەی حەق نەبێ مەیڵێن بۆ خوای گەورەو درۆی بۆ هەڵمەبەستن و خێزان و منداڵی بۆ بڕیار مەدەن، بەڵکو عیسای کوڕی مەریەم تەنها بەندەو پێغەمبەری خوایەو کوڕی خوا نیە، و وشەیەکی خوای گەورە بووە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ مەریەم کە وشەکەش (كُنْ) بوو خوای گەورە بە جبریلی فەرموو پێی بفەرمە: (كُنْ) دروست بە بەو وشەیە یەکسەر عیسی دروست بوو، و ڕوحێك بوو کە لەلایەن خوای گەورەوە خوای گەورە کردیە بەر عیسی(صلى الله عليه وسلم) کە وەکو زیادە ڕێزێکە بۆ عیسی نەك بەشێك بێت لە روحی خوای گەورە، بەڵکو ئیزافەکە بۆ بەگەورەزانین و ڕێزلێنانە وەکو (بيت الله و ناقة الله)، و جبریل فووی کردە ناو ملوانی کراسەکەی مەریەمدا و عیسا بە ئیزنی خوای گەورە بەبێ باوك دروست بوو... [النساء: ١٧١].

پ ١١٣/ چەند مەنزڵگا هەیە؟

و/ سێ مەنزڵگا هەیە:

١ - مەنزڵی دونیای لەناوچوو.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ واتە: ...وە ژیانی دونیا هیچ شتێك نیە تەنها ڕابواردن و هیواو ئومێدو ئاواتێکی کەمی لەناوچووە کە مرۆڤی پێ لە خشتە ئەبرێ. [ال عمران: ١٨٥]

٢ -مەنزڵی بەرزەخ پاش مردن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ واتە: ... و لە پێش ئەمانەوە ژیانی بەرزەخ و ناو قەبر هەیە تا ڕۆژی قیامەت. [المؤمنون: ١٠٠].

٣ -مەنزڵی ئاخیرەت و کۆتایی.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ واتە: ... بەڵام ڕۆژی دوایی شوێنی مانەوەی هەمیشەییە کە کۆتایی نایات گرنگی و بایەخی پێبدەن. [غافر: ٣٩].

پ ١١٤/ ئایا لەگۆڕدا پاداشت و سزا هەیە؟

و/ بەڵێ هەیە:

بەڵگە: سەبارەت بە سزاکە فەرموودەکەی عائیشە یە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پرسیم لەپێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە سزای ناوگۆڕ، فەرمووی: (...عَذَابُ الْقَبْرِ حَقٌّ ). واتە: سزای ناوگۆڕ حەق و ڕاستیە).[1]

---

[1] رواه البخاري (١٣٧٢).

هەروەها سەبارەت بەپاداشت لەگۆڕدا فەرموودەکەی بەڕائە (ڕەزای خوای لێبێ) تیایدا هاتوە: ( ... وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى الْجَنَّةِ، ...). واتە: پۆشاکی بەهەشتی لەبەرکەن و، دەرگایەکی لەبەهەشتەوە بۆ بکەنەوە...[1]

پ ١١٥/ ئەو شتانە چی یە کەشوێنی مردوو ئەکەوێ و کامەیان ئەمێنێتەوە لەگەڵیدا؟

و/ هەریەکە لە خزم و دۆستان و، ماڵ و سامان و، کردەوەکانی شوێنی مردوو ئەکەون، خزم و دۆستان و ماڵ و سامانەکەی ئەگەڕێنەوە و، کردەوەکانی ئەمێنێتەوە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلَاثَةٌ ؛ فَيَرْجِعُ اثْنَانِ، وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ: يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ ). واتە: سێ شت شوێنی مردوو ئەکەون، دووانیان ئەگەڕێنەوە و یەکێکیان ئەمێنێتەوە، هەریەکە لە خزم و دۆستان و ماڵ و سامان و کردەوەکانی شوێنی ئەکەون، جا خزم و دۆستان و ماڵ و سامانەکەی ئەگەڕێنەوە و کردەوەکانی ئەمێنێتەوە ).[2]

پ ١١٦/ ئەو شتانە چین کەلەدوای مردنیش قازانج بەمردووەکە ئەگەیەنن؟

و/ زانستێك سودی لێ ببینرێ و، سەدەقەیەکی بەردەوام (صدقة جارية) و، یان منداڵێکی چاك دوعا و نزای بۆبکات.

---

[1] رواه أحمد (١٨٥٣٤)، وصححه الألباني في المشكاة (١٣١).

[2] رواه البخاري (٦٥١٤)، و مسلم (٢٩٦٠).

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ ؛ إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ). واتە: ئەگەر مرۆڤ وەفاتی کرد کردەوەکانی لێ ئەپچڕێ تەنها لەسێ شت نەبێت: سەدەقەیەکی بەردەوام (صدقة جارية)، یان زانستێك سودی لێ ببینرێ، یان منداڵێکی چاك دوعا و نزای بۆ بکات).[1]

پ ١١٧/ ئەو پرسیارانە چین کەلەناو گۆڕدا لە مرۆڤ ئەکرێ؟

و/ پەروەردگارت کێ یە؟ دین و بەرنامەت چی یە؟ پێغەمبەرت کێ یە؟

بەڵگە: فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازبە (ڕەزای خوای لێبێ) لەفەرموودەیەکی درێژدا کەتیایدا هاتوە: ( ... فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولَانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ. فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا دِينُكَ ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الْإِسْلَامُ. فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ ؟ فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ....). واتە: ...دوو فریشتە دێن بۆلای مردووەکەو، دایدەنیشێنن و، پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێ یە؟...، دینت چی یە؟...، ئەو پیاوە کێبوو کەنێردرا بۆتان؟...[2]

پ ١١٨/ ئایا کەسی باوەڕدار چۆن وەڵام دەداتەوە؟

و/ دەڵێ: پەروەردگارم الله یە، دین و بەرنامەم ئیسلامە، ئەو پیاوەش کەنێردرا بۆمان پێغەمبەری خوایە ﷺ.

پ ١١٩/ ئایا وەڵامی کەسی بێباوەڕ و مونافیق چی دەبێ؟

[1] رواه مسلم (١٦٣١).
[2] رواه أحمد(١٨٥٣٤)، وصححه الألباني في المشكاة(١٣).

و/ بۆ هەرسێ پرسیارەکە دەڵێ: هاهـ، هاهـ نازانم.

بەڵگە: فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازبە (ڕەزای خوای لێبێ) کە لەوەڵامی ١١٩ دا هێنامان.[١]

[١] رواه أحمد (١٨٥٣٤)، وصححه الألباني في المشكاة (١٣).

پ ١٢٠/ باسی هەندێ لەنیشانەکانی ڕۆژیی دوایی بکە؟

و/ ١- نەمانی زانستی شەرعی.

٢ - دەرکەوتنی جەهل و نەفامی.

٣ - بڵاوبوونەوە و زۆربوونی داوێن پیسی.

٤ - زۆربوونی خواردنەوەی عەڕەق.

٥ - زۆری ڕێژەی ژنان و کەمی ڕێژەی پیاوان.

٦ - زۆربوونی کوشت و کوشتا.

٧ - زۆربوونی مردنی لەناکاو.

٨ - زۆربوونی زەوی لەرزە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: ( أَلَا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لَا يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي سَمِعَهُ مِنْهُ: " إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَى، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَذْهَبَ الرِّجَالُ، وَتَبْقَى النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمٌ وَاحِدٌ ).

واتە: ئایا فەرموودەیەکتان بۆ بگێڕمەوە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ کەس لەدوای من ڕاستەوخۆ لێیەوە نەیگێڕێتەوە: لەنیشانەکانی ڕۆژیی دوایی نەمانی زانستی شەرعی و، دەرکەوتنی جەهل و نەفامی و، بڵاوبونەوەی داوێن پیسی و، خواردنەوەی خواردنەوەی عەڕەق و، کەمبوونەوەی ژمارەی پیاوان و، زۆربوونی ژمارەی ژنانە هەتا وای لێدێ بۆ ٥٠ ژن یەك پیاوی شیاو دەبێت.[١]

هەروەها فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلَازِلُ، وَيَتَقَارَبَ

[١] رواه البخاري (٥٢٣١)، و مسلم (٢٦٧١).

الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ، وَهُوَ الْقَتْلُ الْقَتْلُ،...). واتە: قیامەت بەرپا نابێ تاکو زانستی شەرعی نەمێنێ و، زەوی لەرزە زۆردەبێ و، کاتەکان نزیك دەبنەوە و، فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدات و، هەرچ زۆردەبێت کە کوشتارە کوشتار.[1]

هەروەها فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وأن يظهر موت الفجأة) واتە: لەنیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی....مردنی لەناکاو سەرهەڵدەدات و زۆردەبێت).[2]

پ ١٢١/ لە چ ڕۆژێکدا قیامەت بەرپادەبێ؟

و/ لەڕۆژی جومعە دا.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ ؛ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ ) واتە: باشترین ڕۆژێ خۆری بەسەردا هەڵاتبێ ڕۆژی جومعەیە، تیایدا ئادەم درووست کرا و، هەر لەوڕۆژەدا خراوە بەهەشت و، لەوڕۆژەدا دەرهێنرا، هەروەها قیامەت بەرپا نابێ مەگەر لەڕۆژی جومعەدا نەبێ ).[3]

پ ١٢٢/ ئەو نیشانەیە کامەیە ئەگەر دەرکەوت ئیتر دەرگای التوبة دادەخرێ؟

و/ هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

---

[1] رواه البخاري (١٠٣٦).

[2] رواه الطبراني (١١٣٢)، وهو في الصحيحة (٢٢٩٢).

[3] رواه مسلم (٨٥٤).

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا ؛ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ ). واتە: هەرکەسێ التوبة بکات پێش ئەوەی خۆر لەخۆرئاواوە هەڵبێ، ئەوا خوا التوبةکەی لێ وەردەگرێ ).[1]

[1] رواه مسلم (٢٧٠٣).

پ ١٢٣/ گەورەترین فیتنە چی تاكو ڕۆژی قیامەت؟

و/ فیتنەی دەجالە.

بەڵگە فەرموودەكەی هیشامی كوڕی عامرە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ....مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَمَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، أَمْرٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ ). واتە: هەر لەدرووستكردنی ئادەمەوە تاكو بەرپابوونی قیامەت فیتنەیەك نیە گەورەتربێ لەفیتنەی دەجال.[١]

پ ١٢٤/ ئەو شارانە كامانەن كە دەجال ناتوانێ بچێتە ناویانەوە؟

و/ مەككە و مەدینە.

بەڵگە: فەرموودەكەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلَّا سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، ...). واتە: هیچ شارێك نیە ئیلا دەجال ئەچێتە ناوی تەنها مەككە و مەدینە نەبێت...[٢]

پ ١٢٥/ ئەوكەسە كێ یە دەجال دەكوژێت؟

و/ عیسای كوڕی مریم (علیه السلام).

بەڵگە: فەرموودەكەی نەواسی كوڕی سەمعانە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( .... فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ...). واتە: ...عیسا بەدوایدا دەگەڕێ تاوەكو لەدەرگای لود پێی دەگات و، دەیكوژێت.[٣]

---

[١] رواه أحمد (١٦٢٦٥)، وصححه شعيب الأرناؤوط وقال: إسناده صحيح على شرط مسلم.

[٢] رواه البخاري (١٨٨١)، ومسلم(٢٩٤٣).

[٣] رواه مسلم (٢٩٣٧).

پ ١٢٦/ مەیدانی حەشر کوێ یە؟

و/ خاکی شامە.

بەڵگە: فەرموودەکەی مەیمونەی کچی سەعدە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفْتِنَا فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ! قَالَ: ( أَرْضُ الْمَحْشَرِ وَالْمَنْشَرِ، ....). واتە: وتم ئەی پێغەمبەری خوا سەبارەت بەماڵی پیرۆزکراو (بيت المقدس) هەواڵمان بدەرێ؟ فەرمووی: خاکی حەشر و نەشرە.[١]

پ ١٢٧/ حوکمی کەسێك چی یە کەباوەڕی بەزیندوو بوونەوە نەبێت؟

و/ کافر دەبێت.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبْعَثُواْ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ واتە: ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە. [التغابن: ٧]

[١] رواه ابن ماجه (١٤٠٧)، وصححه الألباني في صحيح الجامع(٣٧٢٦).

پ ١٢٨/ شەفاعەی هەرە گەورە کامەیە؟

و/ بریتیە لەو شەفاعەتەی کەبۆ هەموو خەڵکی دەکرێ بۆئەوەی دادگایی و حیساب دەستپێبکات.

پ١٢٩/ کێ خاوەنی ئەو شەفاعەتە گەورەیەیە؟

و/ پێغەمبەر ﷺ.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) لەفەرموودەی زۆر درێژدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ چۆن باسی شەفاعەتی گەورە دەکات و خەڵکی ئەڕۆن بۆلای پێغەمبەرانی تر هەر لەئادەم تا عیسا (سەلامی خوایان لێبێ)، هەموویان ئەڵێن: ناتوانین و تەنها نەفسی نەفسی یانە، تا دێن بۆلای پێغەمبەر ﷺ (....، وَلَكِنِ ائْتُوا مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. فَيَأْتُونِي، فَأَنْطَلِقُ فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي، فَيُؤْذَنُ لِي عَلَيْهِ، ... ).[١]

---

[١] رواه البخاري (٤٧١٢)، ومسلم(١٩٤).

پ ١٣٠/ ئايا بەهەشت و دۆزەخ ئێستا هەن؟

و/ بەڵێ.

بەڵگە: خواى پەروەردگار سەبارەت بە بەهەشت ئەفەرموێ: وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَاتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ واتە: ... خواى گەورە ئەو بەهەشتەى ئامادەكردووە بۆ ئەو كەسانەى كە تەقواى خواى گەورە ئەكەن (ئەم ئايەتە بەڵگەيە لەسەر ئەوەى كە بەهەشت ئێستا دروستكراوەو ئامادەكراوە). [آل عمران: ١٣٣]

هەروەها سەبارەت بە دۆزەخ ئەفەرموێ: وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ واتە: و خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەى كە بۆ كافران ئامادەكراوە (ئەم ئايەتە بەڵگەيە لەسەر ئەوەى كە دۆزەخ ئێستا دروستكراوەو ئامادەكراوە). [آل عمران: ١٣١]

هەروەها فەرموودەكەى ئيبنو عەباسە (ڕەزاى خواى لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ( اطَّلَعْتُ فِي الجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ )، واتە: ڕوانيمە بەهەشت بينيم زۆربەى خەڵكى بەهەشت هەژارەكانن و، ڕوانيمە دۆزەخ بينيم زۆربەى خەڵكى دۆزەخ ئافرەتانن.[١]

پ ١٣١/ ئايا زۆربەى خەڵكى بەهەشت كێن؟

و/ هەژاران.

پ ١٣٢/ ئايا زۆربەى خەڵكى دۆزەخ كێن؟

و/ ئافرەتان.

---

[١] رواه البخاري (٦٤٤٩)، ومسلم (٢٧٣٧).

بەڵگە: فەرموودەکەی عیمرانی کوڕی حوصەینە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ڕوانیمە ناو بەهەشت بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی هەژارانن، هەروەها ڕوانیمە ناو دۆزەخ بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی ئافرەتانن.[1]

پ ١٣٣/ ئایا بێباوەڕ دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەر لەدونیادا چاکەکاربێت؟
و/ نەخێر، چونکە بێباوەڕ بەهیچ شێوەیەك ناچێتە بەهەشتەوە.
بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ... إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ ،...).واتە: ناچێتە بەهەشتەوە تەنیا نەفسێکی موسڵمان نەبێت.[2]

پ ١٣٤/ ئایا یەکتاپەرستان (ئەهلی تەوحید) لەدۆزەخ هەتاهەتایی دەمێننەوە؟
و/ نەخێر، بەڵکو چارەنوسیان بۆ بەهەشتە.
بەڵگە: فەرموودەکەی ئەنەسە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ:، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ ). واتە: لەدۆزەخ ڕزگاری دەبێ هەرکەسێ وتبێتی لا إله إلا الله و بەئەندازەی دنکە جۆیەك خێر لەدڵیدا هەبێت، هەروەها لەدۆزەخ ڕزگاری دەبێ هەرکەسێ وتبێتی لا إله إلا الله و لەدڵیدا

[1] رواه البخاري (٣٢٤٢)، و مسلم (٢٧٣٧).
[2] رواه البخاري (٣٠٦٢)، و مسلم (٢٢١).

بەئەندازەی دنکە گەنمێك خێر هەبێت، هەروەها لەدۆزەخ ڕزگاری دەبێ هەرکەسێ وتبێتی لا إله إلا الله و لەدڵیدا بەئەندازەی دنکە گەردێك خێر هەبێت.[1]

پ ١٣٥/ کێ یەکەمین ئوممەتە ئەچێتە بەهەشتەوە ؟

و/ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( نَحْنُ الْآخِرُونَ، وَنَحْنُ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ...).واتە: ئێمە کۆتا ئوممەتی دونیا و، یەکەمین ئوممەتی قیامەتین، هەروەها یەکەمین ئوممەتین ئەچینە بەهەشتەوە.[2]

پ ١٣٦/ هەندێ لەناوەکانی بەهەشت بژمێرە ؟

و/ ١- خانەی ئاشتی (دار السلام).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ واتە: [لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِنْدَ رَبِّهِمْ] لەلای پەروەردگاریان شوێنێکیان هەیە کە بەهەشتە شوێنی سەلامەتی و پارێزراویە لە هەموو خراپەیەك [وَهُوَ وَلِيُّهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ] و هەر خوای گەورە دۆست و پشتیوان و سەرخەری ئەوانە بەهۆی کردەوە چاکەکانیان کە لە دونیادا ئەنجامیان ئەدا. [الأنعام: ١٢٧].

٢ -خانەی مانەوە (دار المقامة).

---

[1] رواه البخاري (٤٤)، و مسلم (١٩٣).

[2] رواه مسلم (٨٥٥).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ واتە: ئەو خوایەی کە ئێمەی لە چاکەی خۆی لە ماڵی مانەوەو نەفەوتاندا (واتە: لە بەهەشتدا) جێنشین کرد.... [فاطر: ٣٥].

٣ -خانەی سەقامگیری (دار القرار).

بەڵگە: خوای پەروەردگار لەسەر زاری خزمە باوەڕدارەکەی فیرعەون ئەفەرموێ: ﴿يَاقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ﴾ واتە: ئەی هۆزەکەم ! بەراستی ژیانی ئەم دونیایە تەنها لەززەت بردنێکی بەپەلەیە و بەراستی تەنها ماڵەکەی تر (بەهەشت) جێی هەمیشەیی و ئیستیقرارە. [غافر: ٣٩].

پ ١٣٧/ بەرزترین پلەی بەهەشت کامەیە؟

و/ فیردەوسە.

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( .... فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ، فَاسْأَلُوهُ الفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الجَنَّةِ وَأَعْلَى الجَنَّةِ ....). واتە: ئەگەر داواتان لەخوا کرد، ئەوا داوای فیردەوسی لێبکەن، چونکە فیردەوس ناوەڕاست و بەرزترین شوێنی بەهەشتە...[1]

پ ١٣٨/ خەڵکی بەهەشت چەن ڕیزن؟

و/ ١٢٠ ڕیزن.

پ ١٣٩/ چەند ڕیزی لەم ئوممەتەیە؟

---

[1] رواه البخاري (٢٧٩٠).

و/ ٨٠ ڕیزی لەم ئوممەتەیە.

بەڵگە: فەرموودەکەی بوڕەیدەی کوڕی حەسیبە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَهْلُ الْجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ، مِنْهُمْ ثَمَانُونَ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ ). واتە: خەڵکی بەهەشت ١٢٠ ڕیزن، ٨٠ ڕیزی لەم ئوممەتەیە و، ٤٠ ڕیزەکەی تری لە باقی ئوممەتەکانی ترە.[١]

پ ١٤٠/ هەژارەکان چەنێك پێش دەوڵەمەندەکان ئەڕۆنە بەهەشتەوە؟

و/ ٥٠٠ ساڵ (نیو ڕۆژ ).

بەڵگە: فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُسْلِمِينَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِنِصْفِ يَوْمٍ، وَهُوَ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ ). واتە: هەژارەکان بە ٥٠٠ ساڵ (نیو ڕۆژ)پێش دەوڵەمەندەکان ئەڕۆنە بەهەشتەوە.[٢]

پ ١٤١/ درێژی ڕۆژ لای خوای پەروەردگار چەندە؟

و/ یەکسانە بە ١٠٠٠ ساڵ لەم ڕۆژانەی ئێستامان.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ...[وَإِنَّ يَوْمًا عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّون]

واتە: و ڕۆژێکیش لەلای خوای گەورە کە ڕۆژی قیامەتە وەکو هەزار ساڵی دونیا بەسەر کافران تێ ئەپەڕێ لە سەختی و سەغڵەتی و ناخۆشیدا. [الحج: ٤٧].

پ ١٤٢/ ئایا باوەڕداران خوای گەورە ئەبینن لە ڕۆژی دوایی؟

---

[١] رواه أحمد (٢٢٩٤٠)، وصححه الألباني في المشكاة (٥٦٤٤).

[٢] رواه الترمذي (٢٣٥٣)، وصححه الألباني.

و/ بەڵێ ئەیبینن.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ (٢٢) إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵێك ڕوو گەشاوەو پرشنگدارو جوانن و ئەدرەوشێنەوە (٢٢) لەبەر ئەوەی تەماشای خوای گەورە ئەکەن. [القيامة: ٢٢، ٢٣].

پ ١٤٣/ هەندێ لەناوەکانی دۆزەخ بژمێرە ؟

و/ ١- ئاگری بڵێسەدار و گڕگرتوو (لظى).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: واتە: [كلا إِنَّهَا لَظَى] بە دڵنیایی ئەمە ئاگری دۆزەخەو دەکرێتە ناوی، (لَظَى) ناوێکە لە ناوەکانی جەهەننەم واتا ئەو دۆزەخە گڕو بڵێسەی هەیە. [المعارج: ١٥].

٢ -سوتێنەر (سقر).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: واتە: [سَأُصْلِيهِ سَقَر] ئەبێ بیخەمە ناو دۆزەخەوە (سەقەر) ناوێکە لە ناوەکانی دۆزەخ، واتە: ئەیانسووتێنێ. [المدثر: ٢٦].

٣ -ئاگری هەڵگیرساو ( السعير ).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ واتە: بێگومانە شەیتان دوژمنتانە [فاتخذوه عدوا] دەسا ئێوەیش ئەو بەدوژمن بگرن و ڕەفتارەکانی ئەو وەلانێن، چونکە بەڕاستی ئەو هەر گروپ و شوێنکەوتووانی خۆی بانگ ئەکات، بۆئەوەی پێکەوە ببنە یارو هاوەڵی ئاگری دۆزەخی هەڵگیرساوی بڵێسەدار. [فاطر: ٦].

پ ١٤٤/ خەڵکی الأعراف کێن؟

و/ خەڵکێکن چاکە و خراپەیان وەکو یەکە.ئیبنو کەسیر لەتەفسیرەکەیدا ئەڵێ: ...زۆربەی دەستەواژەکانی مانای موفەسیران بۆ خەڵکی الأعراف لەیەکەوە نزیکن و ئەگەڕێنەوە سەر یەك مانا، ئەویش ئەوەیە خەڵکێکن چاکە و خراپەیان وەکو یەکە.هەریەکە لە حوزەیفەو ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعود و، جگە لەکەسێك لەسەلەف و خەلەف ڕایان وایە ڕەحمەتی خوایان لێبێ.[1]

پ ١٤٥/ چارەنوسیان بۆ کوێ یە؟

و/ سەرەتا لەنێوان بەهەشت و دۆزەخ ئەوەستێنرێن و، پاشان چارەنوسیان بۆ بەهەشت ئەبێت.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ (٤٨) أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ واتە: [ونادي أصحاب الأعراف رجالا] هەرئەو (أعراف)یانە لەپیاوە سەر زلە (دۆزەخی)یەکانی قورەیش بانگ دەکەن [يعرفونهم بسيماهم] کە بەسەرو سیماو دیمەنیان دەیانناسن [قالوا ما أغني عنكم جمعكم وما كنتم تستكبرون] و ئەڵێن: دیارە ئەو حەشامەت و زۆریەو، ئەو دەعیەو لووت بەرزیی و خۆبەزل زانینەتان لەبارەی باوەڕ هێنانەوە, هیچ کەڵکێکی پێنەگەیاندن و بێ نیازی نەکردن لە سزای ئەم ڕۆژە ؟ (٤٨) [أَهَؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ] هەر بەو کافرانە ئەڵێن: ئا ئەمانە ئەو ئیماندارانەن کە لە دونیا ئێوە سوێندتان ئەخوارد کە خوای گەورە ڕەحم بەمان ناکات لەبەر ئەوەی فەقیرو هەژارو لاوازن [ادْخُلُوا الْجَنَّةَ لَا

---

[1] تەفسیری ئیبنو کەسیر سورەتی الأعراف: ٤٦

خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ] بەو موسڵمانانە ئەووترێ کە کافران لە دونیا گاڵتەیان پێیان کردبوو دەی ئێوە بچنە بەهەشتەوە، یاخود خوای گەورە بەڕەحمی خۆی هاوەڵانی (ئەعراف) ئەخاتە بەهەشتەوەو پێیان ئەفەرمووێ: ئێوە بڕۆنە بەهەشتەوە بەڕەحمەتی خۆم هیچ ترسێکتان لەسەر نیە لە داهاتووا و خەفەتیش ناخۆن بۆ ڕابردووتان بۆ دونیاتان چونکە خوای گەورە باشتریان پێ دەبەخشێت. [الأعراف: ٤٨، ٤٩].

پ ١٤٦/ پلەکانی قەدەر چەندن؟

و/ پلەکانی قەدەر چوارن، بەم شێوەیە:

١ - زانست(العلم).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمًا واتە: و بێگومان زانست و زانیاریی ئەو خوایە دەورەی هەموو شتێکی داوە، واتە: ئاگاداری کاروباری بوونەوەرەو هیچ شتێکی لێناشارێتەوە. [الطلاق: ١٢].

٢ - نوسین (الكتابة).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ واتە: هەموو شتێکمان لە کتێب و نامەیەکی ئاشکرادا ئامادەو تۆمارکردووە، واتە: لە (لوح المحفوظ)دا کە هیچ شتێکی تیا گومنابێت، هەموو شتێکی بچووك و گەورە وردو درشتمان ئەژماردووە. [يس: ١٢].

٣ - ویست و ئیرادەی خوا (المشيئة).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ واتە: زۆر بەکارە هەرچی بیەوێ دەیکات کەسێك ناتوانێ بەرهەڵستی بوەستێ. [البروج: ١٦].

٤ - درووستکردن (الخلق).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ واتە: لە کاتێکدا خوای گەورە ئێوەو کردەوەکانیشی دروست کردوون، لەبەر ئەوەی هەر خوای گەورە دروستکارە. [الصافات: ٩٦].

پ ١٤٧/ ئایا ئەو بەڵاو ناڕەحەتیانەی ڕوودەدەن هەر بەویستی خوایە؟

و/ بەڵێ.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: واتە: مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وهەر بەڵاو ناخۆشییەك پێش بێت، بێ فەرمان و بڕیاری خوای كارزان نابێت، (ئیرادەو ویستی ئەوی لەگەڵە، كەوابوو خۆتان تەنها تەسلیمی ئیرادەو ویستی خوا بكەن) [التغابن: ١١].

پ ١٤٨/ ئایا قەدەر خێر و شەڕی تێدایە؟

و/ بەڵێ.

بەڵگە: فەرموودەكەی عومەرە كەپێشتر لەوەڵامی پرسیاری یەكەمدا هێنامان تیایدا هاتووە: ...باوەڕ بهێنی بەقەدەر خێر و شەڕی.[١]

پ ١٤٩/ ئەو كلیلانەی غەیب كامانەن كە جگە لەخوای پەروەردگار كەس نایزانێ؟

و/ پیاوێكی دەشتنشین هاتە لای پێغەمبەری خواو (صلى الله عليه وسلم) وتی: خێزانەكەم دووگیانە پێم بڵێ كچی دەبێت یان كوڕ، و لای ئێمە بێبارانییە پێم بڵێ كەی باران دەبارێت، و خۆم دەزانم كەی لە دایك بوومە تۆ پێم بڵێ كەی دەمرم ؟

خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:: إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡس مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡض تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُ واتە: (پێنج نهێنییەكە) [إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ] ، بە دڵنیایی تەنها خوای گەورە ئەزانێ كە كاتی هاتنی قیامەت كەیە چ ڕۆژو مانگ و ساڵێكەو خوای گەورە نەبێ كەس نازانێ ڕۆژی قیامەت كەی دێت نە پێغەمبەرێكی نێردراو نە فریشتەیەكی نزیك لە خوا [وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ] و هەر خوای گەورە خۆی ئەزانێ كەی

---

[١] رواه مسلم (٨).

باران دائەبەزێنێ و ئەبارێنێ و بارانی سودبەخشە یان زیانبەخشە (کەشناسی و ئەزمونی خەڵکی و دیاریکردنی باران بارین بە خێرایی باو پلەی گەرما لەم جۆرە نیەو دروستە هەرچەندە سەدا سەد نیەو زۆرجاریش بە پێچەوانەوە دەردەچێت وەکو بیستراوەو بینراوە) [وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ] و هەر خۆی ئەزانێ چی لە رەحمی ئافرەتاندا هەیە لە نێرو مێ، لە لەشساغی و ناتەواوی، لە بەختەوەری و بەدبەختی، لە خراپەکار و چاکەکار (سۆنارو ئامێرەکان لەم جۆرە نیەو ئەمیش سەدا سەد نیەو زۆرجار بە پێچەوانەوە دەردەچێت وەکو بیستراوەو بینراوە) [وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا] و هیچ کەسێك نازانێ سبەینێ چی بەسەر دێت و چی بەدەست دێنێت لە کاروباری دین و دونیای چونکە غەیبەو خوا نەبێت کەس غەیب نازانێت تەنانەت پێغەمبەرانیش، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یەك مانگ خەفەتی دەخوارد کە بۆهتان بۆ (عائیشە) کراو نەیزانی راستە یان نا، تا خوای گەورە پاکێتی دەرخست و دە ئایەتی لەسەرەتای سوورەتی (نور) دابەزاند، و ئیبراهیم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە فریشتەکان لەسەر شێوەی مرۆڤدا هاتن غەیبی نەزانی و نەیناسین و رۆیشت گوێلکێکی سەربڕی و سوری کردەوەو بۆی هێنان کە نەیانخوارد ترساو پاشان خۆیان پێیان راگەیاند کە ئەمان فریشتەن و خواردن ناخۆن، و کاتێك چوون بۆ لای لوط پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەمیش ترسا قەومەکەی دەستدرێژی بکەنە سەریان و نەیناسین و غەیبی نەزانی تا خۆیان پێیان وت: مەترسە ئەوان ناگەنە ئێمەو ئێمە فریشتەی خوای گەورەین، و یەعقوب پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە خەفەتی یوسفی کوڕی (صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە گریا تا چاوەکانی کوێر بوو غەیبی نەزانی و نەیزانی لە میصرە تا دواتر یوسف (صلی الله علیه وسلم) ناردی بە شوێنیانداو بە یەکتر شادبوونەوە، و سولەیمان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەوەی باو شەیتان و جن لە

ژێر دەسەڵاتیدا بوون هەواڵی بەلقیسی پاشای نەزانی تا هودهودەکە هەواڵی بۆ هێنا، کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزانە غەیب نەزانن چۆن فاڵچی و جادووگەرو ساحیر غەیب دەزانن؟! پێویستە مرۆڤی موسڵمان باوەڕیان پێ نەکات چونکە باوەڕ پێکردنیان دەبێتە هۆی کافر بوون و لە دین دەرچوون، چونکە باوەڕ نەبوونە بە چەندەها ئایەتی قورئان و فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، و باوەڕیشیان پێ نەکەیت و تەنها بچیت بۆ لایان ئەوا چل رۆژ نوێژت لێ قبوڵ نابێت وەکو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی [وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ] و هیچ کەسێکیش نازانێ لە چ زەویەکدا ئەمرێ و ئەجەلی لە کوێ دێت [إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایە و زانیاریەکی زۆر وردی هەیە و هیچ شتێك لە خوای گەورە ناشاردرێتەوە. [لقمان: ٣٤].

پ ١٥٠/ جۆرەکانی قەدەر چەندن و کامانەن ؟

و/ چوارن، بەم شێوەیە:

١ - تەقدیری ئەزەلی.پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە ٥٠ هەزار ساڵ.

بەڵگە: فەرموودەکەی عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاصە (ڕەزای خوای لێبێ) ئەفەرموێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( كَتَبَ اللهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ...). واتە: خوای پەروەردگار قەدەری دروستکراوەکانی نوسیوە ٥٠ هەزار ساڵ پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی درووست بکات، هەروەها فەرمووی: عەرشەکەی لەسەر ئاو بوو.[١]

---

[١] رواه مسلم (٢٦٥٣).

٢ - تەقدیری تەمەنی. کاتێك پەیمانی وەرگرت و، لەکاتی درووستکردنی نوتفە لە ڕەحمی ئافرەتدا.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ واتە: و پەروەردگار کاتێك کە ئادەمی دروست کرد هەرچی نەوەی ئادەم هەیە تا ڕۆژی قیامەت هەر هەمووی لە پشتی ئادەم دەرکرد و کردنی بە شایەت بەسەر نەفسی خۆیانەوە، و خوای گەورە پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم هەرچی نەوەی ئادەم هەیە هەر هەموویان وتیان: بەڵێ شایەتی ئەدەین کە تۆ پەروەردگاری ئێمەی خوای گەورە فەرمووی: بۆیە ئێستا پێتان ئەڵێم تا لە ڕۆژی قیامەت نەڵێن ئەی پەروەردگار ئێمە لە یەکخواپەرستی تۆ بێ ئاگاین و نەمانزانی کە تۆ تاك و تەنهایت و شەریکت نیە. [الأعراف: ١٧٢].

هەروەها فەرموودەکەی ئیبنو مەسعود ڕەزای خوای لێبێ ئەوەی کەباسی کۆکردنەوەی خەلقی منداڵ دەکات لەڕەحمی ئافرەتدا کەدوای ٤ مانگ خوای پەروەردگار فریشتەیەکی بۆ دەنێری فەرمانی پێدەکات ڕۆحی بەبەردا بکات و چوار وشەی لەسەر بنوسێ (.... وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: بِكَتْبِ رِزْقِهِ، وَأَجَلِهِ، وَعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ....). واتە: فەرمانی پێدەکات بەنوسینی: ڕزقەکەی و، ئەجەلەکەی و، کردارەکانی و، هەروەها خراپەکار و خەسارەتمەندە یا چاکەکار و بەختەوەرە....[١]

٣ - تەقدیری ساڵانە.لەشەوی قەدر.

---

[١] رواه البخاري (٣٢٠٨)، و مسلم (٢٦٤٣).

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ واتە: لەم شەوەدا کە شەوی (قەدر)ە هەموو کارێکی موحکەم و دامەزراو و کاربەجێ تیایدا یەکلایی و ڕوون ئەکرێتەوە. واتە: لە ماوەی ساڵێکدا چی ڕوو ئەدات لە رزق و رۆزی و ئەجەل و ئەوەی کە روو دەدات خوای گەورە لە شەوی (قەدر)دا دووبارە بڕیاری لەسەر ئەداتەوە، نەك لە شەوی پانزەی (شەعبان)دا وەکو دەوترێت، بەڵکو لە شەوی (قەدر)دا. [الدخان: ٤].

٤ - تەقدیری ڕۆژانە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ واتە: هەموو ڕۆژێك خوای گەورە لە ئیش و کاری خۆیدایە، کەسانێك ئەژێنێت، کەسانێك ئەمرێنێت، ڕزق و ڕۆزی بە کەسانێك ئەدات، لە کەسانێك خۆش ئەبێ، کەسانێك بەرز ئەکاتەوە، کەسانێك نزم ئەکاتەوە، کەسانێك لەشساغ ئەکات، کەسانێك نەخۆش ئەکات، وەڵامی کەسانێك دەداتەوە، بە کەسانێك دەبەخشێت، کەسانێك لە ناخۆشی و تەنگوچەڵەمە رزگار دەکات، و بەو شێوازە. [الرحمن: ٢٩].

